# کاروان

4

کانونی دووەم 1983

گۆڤارێکی رۆشنبیری‌ی مانگانەیە
ئەمینداریتی‌ی گشتی‌ی رۆشنبیری ولاوان
بەزمانی کوردی‌و عەرەبی دەری دەکا



■ لەم ژمارەیەدا ■

لەبیرەوەریی «٦٢»سالەی دامەزراندنی سوپای قارەمانی عێراقدا

# سڵاو لە سوپای

## ئەوپەڕی خۆشەویستی بۆ سەرۆکی فەرماندە صدام حسین

لە ڕۆژی (٦)ی کانونی دووەمی ئەم سالدا بیرەوەرییەکی خۆشەویست بەسەر ئێمەو گەلی عێراقماندا رەت دەبێت کە ئەویش ڕۆژی دامەزرانی سوپا قارەمانەکەی عیراقە، ئەم بیرەوەرییە دەورێکی کاریگەری هەیە لە ویژدانی ئێمەدا، لەکاتێکدا کە سوپا ئازاکەمان لەسەر سنووری ڕۆژهەلاتی وولاتدا شەری شەرەفو پالەوانیەتیو خۆبەخت کەرانە دەکاتو بەشداری دەکات لە شەڕی قادسیەی صدامدا دژ بە دوژمنی فارسیی رەگەز پەرستو دڵ پر لە قین، لە هەمانکاتدا کە گەلەکەمان ئاهەنگی جەژنی لەدایك بوونی سوپا مەزنەکەی دەگێڕێ کە دوو سالو چوار مانگ بەسەر جەنگە ڕەواکەماندا ڕەت دەبیت لەگەل رژێمی فارسیی لووت بەرزو پاسەوانەکانی خومەینی وە لە گەرمەی ئەم ئاهەنگ گێرانەشدا سوپا مەزنەکەمان بە دەستێکی درێژو پۆلایینەوە لە رژێمە تەلەکەبازەکەی قومو تاران دەدات بۆ ئەوەی ئەو سەرە بۆگەنانە بپلیشێنێتەوە کە ئیمرۆ حوکمی ئێران دەکەن. سوپای مەزنمان بە سەرۆکایەتی سوار چاكو پالەوانی ڕزگاریی خوازی نەتەوەیمان هەڤال صدام ڕۆژ لە دوای ڕۆژ سەرکەوتن لە دوای سەرکەوتن وەدەست دەهێنن لە پێناوی وەرگرتنەوەی مافە ڕەواکانی عیراقماندا لە خاكو ئاوو پاراستنی کەرامەتی گەلو خاك لەدەست ئەم دوژمنداریە ناپەسەندەدا .

جەنگی قادسیەی صدام بە درێژایی ماوەی شەڕ لە نوێوە سەلماندی کە سوپای عێراقو گەلەکەی، دەتوانن بەربەرچی ئەم دوژمنداریەتیە بدەنەوە جا لە هەر لایەك بێتو هەر چۆنێك بێت، وە هەر چەند رژێمی فارسیی نەزان هەولی بەردەوام بوونی شەڕ بدات، ئەوەندە زیاتر پایەی عێراق لە نێو دەولەتانو هەموو بوارێکی تردا بەرز دەبێتەوە، هەروەها باوەڕی گەلانی جیهان زیاتر دەبێت بە توانایی عێراقو سوپاو فەرماندە سەرکەوتووەکەی صدام حسین .

سەر لێشێوانی رژێمە کۆنەپەرستەکەی خومەینی نەزان بەسەپاندنی شەڕ بەسەر وولاتە خەبات گێرەکەماندا، وای لەو رژێمە کرد گۆڕی خۆیان بەدەستی خۆیان هەل بکەننو گەلانی ئێرانی سەر لێشێواویش بخەنە نێو کوورەی شەڕەوە . هەر بۆیەشە کە ئێمرۆ گەلی ئێران بەدەست برسێتیو بێبەشی لە هەموو مافێکی ڕەوایاندا دەنالێننو تێك چوونو وێران کاری بە هەموو کونجێکی ئێراندا بلاو بۆتەوەو ئێستایش بەڕونی بۆ ڕای گشتیی ئێرانو هەموو جیهان دەرکەوت کەوا ڕژێمی ئێرانی دەیەوێ درێژە بە شەڕ بدات لەگەل عێراقدا، هەر چەندە بۆشی ئاشکرا بووە کە زیانەکانی ڕۆژ لە دوای ڕۆژ گەورەتر دەبن . بەلام وەکو دیارە ئەنجامی شەڕ ئەنجامێکی تاریك دەبێت بۆ دەسەلات دارە نەزانەکانی قومو تاران، ئەو ڕۆژەش دێ کە گەلانی ئێران بە عەرەبو کوردو بلووشو ئازەربایجانیەکانەوە سنووری دابنێن بۆ کۆتایی پێهێنانی رژێمی دواکەوتووییو کۆنەپەرستانەو خوێن ڕشتن لە ئێراندا .

لە کاتێکدا کە یادی (٦٢) سالەی دامەزراندنی سوپای قارەمانمان دەکەینەوە، ئەو سوپایەی کە ئیمڕۆ وەکو چیایێکی بەرز وەستاوەو پارێزگاری لە سنووری ولاتی خۆشەویستمان دەکات، لە هەمان کاتدا منالانی عێراق نەخشەی دوا ڕۆژ دەکێشن بۆ ئەو ولاتەی کە سوار چاکی ئازا صدام حسین سەرکردایەتی دەکات، ئەو سەرکردەیەی کە عێراقو گەلەکەی گەیاندە بەرزترین پلەی پێشکەوتنو سەربەرزی لە هەموو بوارەکانی ژیانو سەر بە خۆیی سیاسیو ئابووریو بنیات نانی کۆمەلایەتیدا .

هەر بەم بۆنە پیرۆزەشەوە گەلو سوپا مەزنەکەمان پەیمان تازە دەکەنەوە بۆ سەرکردەی کاروان، کە هەموویان یەك دەست بنو چاوێکی کراوە بنو بە گیانێکی لە خۆ بوردووانەوە پارێزگاری لە دەسکەوتە مەزنەکانی شۆڕش بکەن، هەروەك سەرۆکی فەرماندە هەڤال صدام حسین دەلێ :

شەڕی ئێمە لەگەل فارسیی رەگەز پەرستو دوژمندا شەڕێکی ڕەوایە، جا هەر کەسێك هاوبەشیەکی شەرەفمەندانە بکات لەم شەڕەدا بە درێژایی ژیانی بەسەر بەرزی دەژی، وە ئەوەی شەهیدیش دەبێ لە لای خوا روو سپی دەبێ، چونکە ئەمە ئەرکێکەو وا پێویست دەکات کە هەموو هاوولاتیەك بەشداری شەڕ بکات لە پێناوی شەرەفی خۆیو مال منالو خاکەکەیدا .

سلاوی ڕێزو شکۆمەندی بۆ سەرکردەی کاروانو بەرز کەرەوەی ئالاکەمان بەرەو لوتکەی سەربەرزی هەڤال صدام حسینو بۆ گەلە مەزنەکەمان و سوپای دلێری سەرکەوتومان لە جەژنی دامەزرانی سوپای قارەمانماندا ..

((سەرنووسەر))

# ئازایەتی و قوربانیدان

**(٦)ی کانوونی دووەمی (١٩٢١)**

بێگومان کاتێ باس لە سەرەتای دامەزراندنی سوپای عێراق دەکرێ دەبێ لەگەڵیدا ئیشارەت بە شۆڕشی نیشتمانیی ساڵی ١٩٢٠ یش بدرێ، چونکە هەر ئەو شۆڕشە مەزنە بوو کە ئەگەرچی ئامانجە سەرەکییە راستەو خۆکانی خۆی بۆ بەدی نەهێنراون، بەڵام بووە هۆی ناچارکردنی ئیمپریالیزمی بەریتانی کە مل بۆ پێکهێنانی دەوڵەتی عێراق بداو بەدوایدا دەوڵەتەکەشی روو لە دامەزراندنی سوپای تایبەتیی خۆی بکا . ئیتر ئەوەبوو یەکەم حکوومەتی عێراقی بە سەرۆکایەتیی عبد الرحمن النقیب پێکهات .

ئینجا ئەنجومەنی وەزیران لەسەر پێشنیازی وەزیری بەرگری (کە فەریق جعفر عەسکەری بوو)، بڕیاری دامەزراندنی سوپای عێراقی داو بە مەرجێکیش کە «رێکخستن و سازدان و چەک و جباخانەی لە بابەتی سوپای بەریتانیا بێ» . بەدوایدا لە رۆژی (٦)ی کانوونی دووەمی (١٩٢١)دا دەست کرا بە دامەزراندنی بارەگای گشتیی سوپاو ئەوە بووە رۆژی دامەزراندنی و بەدەمییەوە چوار دایەرەی سەرەکیی بۆ پێکهێنران کە بریتی بوون لە دایەرەی جموجووڵ و بەڕێوەبردن و پزیشکی و دارایی و چەند ئەفسەرێکیشیان بۆ هەڵسووڕاندنیان تێدا دامەزرێنران .

ئەو ئەفسەرانەی لە سەرەتای پێکهێنانی بارەگای گشتیی وەزارەتی بەرگرییەوە چوونە ریزی سوپاوە، ئەم زاتانە بوون :

١ - **پێشەوای شوورا حمید بەگ (مەبەست لە موقەدەم روکن عبد الحمید احمد)ە .**
٢ - **پێشەوای شوورای جەنگ توفیق وهبي بەگ (مەبەست موقەدەم روکن توفیق وهبي)ە .**
٣ - **پێشەوا «عبد الرزاق بەگ خوجە» .**
٤ - **جێگری پێشەوا «عبد الرزاق بەگ محمد اغا» .**
٥ - **نەقیب «سعید حقي افندي» .**



٦ - نەقیب «حاجي محي الدین سلیم افندي» کە بە «السهروردي» ناسراوە .
٧ - نەقیب «محي الدین افندي» کە ئەمەیشیان «محي الدین عمر»و بە «الخیال» ناسراوە .
٨ - نەقیب «تحسین العسکري» .
٩ - نەقیب «یوسف افندي الپاچەچی» .
١٠ - رایدی روکن «بەکر صدقي» .
١١ - نەقیب «محسن علوش» .
١٢ - ئەفسەر «رشید خضر» .
١٣ - ئەفسەر «عبد الحمید محمد» .

وەهەر دوا بەدوای ئەو دەزگاو دایەرانەی کە لە پێشەوە باسمان کردن عێراقییەکانی دەرەوەی ولاتیش دەستیان کرد بە گەڕانەوە بۆ عێراق و لەوانەشی بەشێکی زۆریان ئەو سەربازو ئەفسەرانە بوون کە لە شۆڕشی عەرەبیدا لە حیجازو لە سوپای عەرەبی سوریادا بەشدار بوون .

● سەرەتا (٢٣٤) سەرباز :

یاسای سەربازیی ئیختیاری لە سەرەتای حوزەیرانی ساڵی ١٩٢١دا کاری پێکراو لەو یاسایەدا دەڵێ :

«هەر عێراقییەك کە تەمەنی لە نێوان [١٨ - ٤٠] ساڵ بێت، بۆی هەیەبێت بە سەربازی یێختیاری لە سوپای عێراقدا» . ئیتر هەر لە مانگی حوزەیراندا ژمارەی ئەو سەربازانەی بە ئیختیاری چوونە نێو سوپای عیراقەوە گەیشتە [٢٣٤] سەرباز .. یەکەم کەسیش کە چووە ریزی سوپای یێختیاریەوە مەلیك فەیسەلی یەکەم بوو پێش ئەوەی ببێ بە مەلیك .لەوە بەدواوە رۆژ بەرۆژ پەرەی سەند، تاوای لێهات یەکەم فەوج لە بەغدا لە رۆژی ٢٨ی تەموزی ساڵی ١٩٢١دا دامەزراو فەرمانی مەلەکی بۆ دە رچوو، فەوجەکەشی بە «فەوجی موسی الکاظم» ناونرا ..

## بەرەو ئەش و نماکردن :

**قوتابخانەی مەشق پێکردن :**

هەموو ئەو ئەفسەرانەی چوونە ریزی سوپاوە لە دەرچووانی کولێجی جەنگیی عوسمانی بوون و جۆری مەشقەکەیشیان جیاوازیەکی تەواوی هەبوو لەگەڵ ئەو جۆرە مەشقەی کە بڕیار بوو لە سوپای عێراقیدا پەیڕەو بکرێت، کە جۆری مەشقی بەریتانی بوو، بۆیە بڕیار درا دەورەی تایبەتی بکرێتەوە تاوەکو لەسەر ئەو جۆرە مەشق پێکرونە رابهێنرێن؛ ئەوەبوو لە رۆژی (٢٤)ی تەموزی ساڵی ١٩٢١دا قوتابخانەیەك دامەزرێندرا بەناوی «قوتابخانەی مەشق پێکردن» ەوەو یەکەم لێپرسراویشی موقەدەم روکن «محمد امین زکي» بوو؛ وە لە ئاهەنگی کودنەوەی ئەو قوتابخانەیەشدا «میر فەیسەل» حازر بوو کە ئەوکاتە تازە گەیشتبووە عێراق و هێشتا نەبوو بوو بە «مەلیك» . هەروەها باوەرپێکراوی «سامی» بەریتانی «بەرسی کۆکس»و چەند کەسانێکیش لە پیاو ماقوڵ و ناودارەکانی ولات ئامادە بوون .

**قوتابخانەی عەسکەری :**

**فراوان بوونی سوپاو زیاد بوونی لەلایەك و کەمی ئەفسەری لاوو تازە پێگەیشتوو لەلایەکی دیکەوە، وای پێویست دەکرو کە قوتابخانەیەکی عەسکەری دابمەزرێت بۆ پێگەیاندنی لاوەکان، ئەوەبوو قوتابخانەی عەسکەری دامەزرێندراو وەکوو بەشێکی تایبەتی بۆ یەکەم جار درایە پاڵ قوتابخانەی مەشق مەشق پێکردن و ناوێکی تازەی لێنرا کە بریتی بوو لە تێکەڵاو کردنی هەردوو ناوەکە - واتە قوتابخانەی عەسکەریو قوتابخانەی مەشق پێکرون - ئیتر لەدواییدا بوو بە «قوتابخانەی عەسکەری» .**

**قوتابخانەی عەسکەری کە لە ١٢ی ئایاری ساڵی ١٩٢٤دا کرایەوە «٦٨» قوتابی وەرگرت کە بەشی زۆریان لە دەرچووانی قوتابخانە ناوەندییەکان بوون، هەندێکیان خەڵکی شارەکان بوون و ئەوانەی ئەوانەی تریشیان کوڕی ئەو کەسانە بوون کە سەر بە عەشیرەتەکان بوون .**

**دوای سێ ساڵ، واتە لە ساڵی ١٩٢٧دا یەکەم دەستە لە ئەفسەرە لاوەکانی سوپای عێراقی لە قوتابخانەی عەسکەری دەرچوون، .. وەهەر لە هەمان ساڵدا هەموو ئەو بەشانەی درابوونە پاڵ**

**قوتابخانەی عەسکەری لێی جیا بوونەوەو لە بریتی ئەو بەشانە دەورەیەکی تایبەتی کرایەوە بەناوی «دەورەی یاریدەدەران»و لێپرسراوێکی بۆ دانرا کە ئەویش موقەدەم «تۆفیق وەهبی» بوو .**

**کۆلێجی سەربازیی مەلەکی :**

دوای ئەوەی کە یەکەم دەورە لە قوتابخانەی عەسکەریدا دەرچوون، ئیتر قوتابخانەکە گوێزرایەوە بۆ بارەگا تایبەتیەکەی خۆی کە ئەوسا لە «کەرادە» بوو، ئەویش سەرەتای تەموزی ساڵی ١٩٢٧ بوو .

ماوەی خوێندن لەو قوتابخانەیەدا ـ واتە لە کۆلێجی سەربازیی مەلەکی ـ بۆ شارییەکان سێ ساڵو بۆ کەسانی سەر بە عەشیرەتەکان پێنج ساڵ بوو ..

لە ساڵ ١٩٣٩دا یاسایەکی تازە دەرچوو کە بەپێی ئەو یاسایە قوتابخانەی عەسکەری گۆڕاو بوو بە کۆلێجێکی باڵاو ماوەی خوێندنیشی تیادا کرا بە سێ ساڵ بۆ دەرچووانی قوتابخانە ئامادەییەکان ..

**کۆلێجی ئەرکان :**

لە ساڵی ١٩٢٨دا بیر لەوە کرایەوە کە دەبێ کۆلێجێک بۆ ئەرکان دابمەزرێندرێ بۆ ئەوەی ئەفسەری وا هەبن کە خاوەنی رۆشنبیرییەکی سەربازیی بەرز بن، ئیتر قوتابخانەی ئەرکان لە «کەرادەی شەرقی» کرایەوەو ئەوسا لە بیناکەی کۆلێجی عەسکەریدا شوێنی خۆی گرتو پاشانیش ناونرا بە «کۆلێجی ئەرکان» .

**کۆلێجی هێزی ئاسمانی :**

دوای ئەوەی کە هەموو بەشەکانی سوپا بەتەواوەتی دامەزرا، وا بە پێویست زانرا کە هێزی ئاسمانیش دابمەزرێ، وە بۆ ئەنجام وانی ئەم مەبەستەیش لە ساڵی ١٩٥٧دا یەکەم دەستەی قوتابیان نێردران بۆ ئینگلترە بۆ فێر بوونی هونەری فرۆکەوانیو ئەم دەستەیەیش لە قوتابیان، لە رۆژی ای مانگی ئەیلوولی ساڵی ١٩٢٩دا لە کۆلێجی «کرانول» وەرگیرانو قوتابیەکانیش بەسەر بەشە تایبەتیەکاندا دابەشی کران بۆ مەشق پێکرون، وە لە نێوان ساڵانی ١٩٢٧ ـ ١٩٣٠ هەندێ ئەفسەری تریشی نێردران بۆ هەمان مەبەست، ئەم کارەیش تاوەکو «١»ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٣٣ بەردەوام بوو، ئیتر لەوە بەدواوە قوتابخانەیەکی فرۆکەوانی کرایەوەو لە ساڵی «١٩٥٠»شدا گۆڕا بە «کۆلێجی هێزی ئاسمانی» ..

# سوپای گەل

سوپای عێراق کە هەر لەسەرەتایەوە، لەو وەختەوەی بە (٢٣٤) سەربازی ئیختیاری دەستی پێکرد، لە کوڕو کاڵانی چینە زەحمەتکێشەکانی گەل پێکهاتو بووە سوپای گەلو هەردەم لەگەڵ خواستو ئاواتو ئامانجەکانیدا بووەو چەندە ئیمپریالیزمو حوکمڕانە کۆنەپەرستە نۆکەرەکانی تەقەلایان دابێ، نەیانتوانیوە لێیانی دابڕ بکەنو دژیان هەڵیسوورێنن . نموونەش بۆ ئەم راستییە چەندین هەڵوێستی مێژووییە بە درێژایی (٦٢) ساڵەی تەمەنی لە ژیانی سیاسیی عێراقی نوێدا کە پڕو چڕ بووە لە بزوتنو ئاڵو گۆڕو نوێ بوونەوە لە هەموو روویەکەوە . لەوانە بزووتنەوەی مایسی (١٩٤١) لەرووی ئیمپریالیزمی بەریتانیداو بەشدار بوونی ئازایانەی ساڵی (١٩٤٨) لەشەڕی فەلەستینداو بەرپاکردنی شۆڕشی (١٤)ی تەمووز کە رژێمی کۆنەپەرستی پاشایەتیی گۆڕ کردو رژێمی جەمهوریی لە وڵاتدا دامەزراندو بەرپاکردنی شۆڕشی (١٤)ی رەمەزانو دەوری کاریگەری لە شەڕی حوزەیرانی (١٩٦٧)دا، تا بەرپاکردنی شۆڕشی (١٧ ـ ٣٠) تەمووزی (١٩٦٨)ی پیرۆزو بەشدار بوونی پڕ لە شەرافەتمەندانەی لەشەڕی تشرینی (١٩٧٣)دا لە رووی زایۆنیزمداو دواجار جەنگە پیرۆزەکەی (قادسیەی صدام)ی لەگەڵ رژێمی کۆنەپەرستی ئێراندا .

ئەمانەو چەندین هەڵوێستی تری سوپای قارەمانی عێراق ، بەڵگەی مێژوویینو شایەتیی بۆ دەدەن کە ئەو هەردەم سوپای گەل بووەو لە هیواو ئاواتو ئامانجەکانی گەل دابڕ نەبووە، بەڵکو بە سەربەرزییەوە ئەرکی سەرشانی خۆی لەم رووەوە بەجێ هێناوەو لەم پێناوەدا ئەو پەڕی ئازایەتیی نواندوەو لە ئاکامیدا دریغیی لە قوربانیدانیش نەکردوەو لاپەرەکانی تەمەنی (٦٢)

ساڵەی، پڕن لە نموونەی فیدکاریو پاڵەوانێتی، بە تایبەتی لەو جەنگە پیرۆزەیدا کە دوو ساڵو چوار مانگە بە فەرماندەیەتیی پاڵەوانی رزگاریخواز صدام حسین، لەرووی دەسدرێژیی رژێمی خومەینیی دوژمندا لەسەری بەردەوامە .

# ● سوپای گەل لە قادسیەی صدامدا

گومانی تێدا نی یە کە سوپای عێراق لە دوای شۆڕشی (١٤) ی تەمووزەوە ، رووی لەوە کرد ببێتە سوپایەکی ئەوتۆ بتوانێ لە سایەی رژێمی کۆماریدا چاکتر ئەرکە مێژوویی یەکانی سەرشانی خۆی بەرامبەر بە گەلو نیشتمان بەجێ بێنێ . بەڵام گومان لەوەشدا نی یە کە لەگەڵ بەرپابوونی شۆڕشی (١٧ ـ ٣٠) تەمووزی (١٩٦٨) دا بە پێشەوایەتیی حیزبی بەعسی عەرەبیی سۆشیالیست رووی لەوە کرد ببێتە سوپایەکی بەزەبرو زەندی هەقیانەتی ئەوتۆ کە چ بەچەکی بیرو باوەڕو چ بە چەکی ئاگرو ئاسن ، بتوانێ بەوپەڕی لێهاتوویی و ئازایی یەوە ، ئەو ئەرکانەی سەرشانی خۆی بەجێ بێنێ . ئەم راستی یە زۆر بە روونی لە ماوەی بیستو هەشت مانگەی رابوردووی جەنگی (قادسیەی صدام) دا خۆی سەلماندو بۆ دۆستو دوژمن ئاشکرا بوو .

جەنگی (قادسیەی صدام) تاقیکردنەوەیەکی بەڵگە نەویستی ئازایەتی و فیداکاریو قوربانیدانی سوپای قارەمانی عیراقە لەپێناوی پارێزگاریکردندا لەسەربەخۆیی و سەرفرازی و ئاسوودەگیی گەلو نیشتمانی عیراقداو بەرگرتن لەهەر دەسدرێژی کردنێك کە لەلایەن دوژمنانەوە بکرێتە سەریان .

ئاشکرایە کە ئیمپریالیزمی ئەمەریکایی و زایۆنیزمی جیهانی و ئیسرائیلی دەسنێژیانو بەرەی کۆنەپەرستان لەناوچەی رۆژهەلاتی ناوەڕاستداو لەپێشیانەوە رژێمی رەگەزپەرستی ئێرانی ، لێیان خۆش نەدەهات عێراقی بەعس وڵاتەکەی گەشەپێبداو گەلەکەی بەرەو شادمانی و ئاسوودەگی ببات و دەوڵەتێکی نوێی بەهێزو زەبربەدەستو خاوەن پایەو پلەیەکی



ڕێزدار لە نێو دەوڵەتانداو بەتایبەتی بەرەی بێ لایەناندا پێک بهێنێ . بەلام سوپای قارەمانی عێراقی خاوەن ئەو مێژووە پڕ لە تاقیکردنەوە گرانبەهایانەو پڕ لە شەرافەتمەندی و ئازایەتی و قوربانیدانە ، سەر لە نوێ لە جەنگی (قادسیەی صدام) داو بە فەرماندەیەتی ی پێشەوای بە جەرگی (صدام حسین) ، دووپاتی کردەوە کە سوپای گەلێکی مەزنی کوڵنەدەرەو هەرگیز بوار نادا دوژمنان لە ئیمپریالیزم و زایۆنیزم و کۆنەرستان ، زەفەر بە ولاتی عێراق و گەی عێراق بەرن و هەردەم لە سەر پێ یە بۆ پووچ کردنەوەی پیلانەکانیان و پاریز گاری کرون لە سەربەخۆیی و سەربەستی ی عێراق و لە دەسکەوتە پیرۆزەمکانی شۆڕشی (١٧ - ٣٠) تەمووز .

## لەشکری میللی

کاتێ شۆڕشێک بەراست و دروستی دەبێتە شۆڕشی گەل و دەبێتە ئاوێنەی خواست و ئاواتەکانی و ئامانجەکانی لە هەموو بوارێکی سیاسی و ئابووری و کومەلایەتی و ڕۆشنبیریدا بەجێ دێنی ، هەموو گەل بۆی دەبێتە چەپەرو فیداکارانە لە ڕووی دوژمنانیدا بەرگری لێدەکا .

لەشکری میللی کە لەسەر بنچینەی خۆکرون بە سەرباز بە ئیختیاری دامەزراوەو ئامانجی سەرەکی ی ، یاریدەدانی سوپایە لە پاریزگاری کردندا لە شۆڕش ، ئاوێنەیەکی ڕوونی بەلگەی سوور بوونی گەلی عێراقە لەسەر فیداکاری لە پێناوی شۆڕش و بیرو باوەڕەکانیداو لەسەر ماوەنەدانی بە دوژمنان لەسەر گرتنی پیلانەکانیاندا .

لەشکری میللی جگە لەوەی لە ڕۆژی دامەزراندنییەوە گەلێ ئەرکی گەورەی لە یاریدەدانی سوپادا لە کاتی پێویستدا بەجێ هێناوە ، ئەرکی بەجێ هێنراوی هەرە گەورەی لەو دەورە کاریگەرەدایە کە لە سەرەتای جەنگەوەو تا ئێستاش ، چ لە پاریزگاری کردنی ئەمن و ئاسایشی ناوخۆداو چ لە جەبهەی شەڕدا دەینوێنێ .

لەشکری میللی بە درێژایی ماوەی جەنگ سەلماندی کە پاڵپشتێکی پتەوو بەهێزی هێزە چەکدارەکانمانەو لەم پلەیەی کاروانی شۆڕشدا ، دەوری مێژوویی خۆی دەگێڕێ ..





# ئەدیب و ئەرکەکانی قۆناغ لەبەر رۆشنایی تاقیکردنەوەکانی ئەوروپای رۆژگاری «رێنیسانس»دا

– بەشی یەکەم –

**پێشکەشە بە « یەکیەتی نووسەرانی کورد »**

**چەند وشەیەك :**

کاتی خۆی چەند جارێك برایانی « یەکیەتی نووسەرانی کورد » داوایان لێ کردم بەشداری‌ی لە یەکێك لە کۆڕە سەرکەوتووەکانی یەکیەتیدا بکەم . ئەو کارەی ، زۆر بەداخەوە، لەبەر چەند هۆیەکی تایبەتی بۆم نەکرا ، هەرچەندە هەر ئەوسا کەوتمە گەڵاڵە کردنی ئەم بەرهەمە بۆی کەئێستە وا لە « کاروان »ی کۆڕپەدا بڵاوی دەکەمەوەو پێشکەشیش بەوانی خۆشەویستی دەکەم . پێم‌وایە لێکۆڵینەوەیەکی وەك « ئەدیب و ئەرکەکانی قۆناغ لەبەر رۆشنایی تاقیکردنەوەکانی ئەوروپای رۆژگاری رێنیسانسدا » شایانی ئەوەیە پێشکەش بە «یەکیەتی نووسەرانی کورد » بکرێ کە جێگەی رەوای لە قوڵایی دەروونی هەموو رووناکیرێکی دڵسۆزی کوردا بۆ خۆی کردۆتەوە ، لەوانەشە هەر ئەوە پاڵنەیەکی پچووکم لای ئەندامانی یەکێتی بۆ بکات کە بەرهەمی نازدارو سەرکەوتووی هەریەکەیان بۆتە هاندەرو بزوێنەری خاوەنی ئەم وتارەی بە لەش لێیان دوورو بە گیان لەناو جەرگەیاندایە .

**سەرەتا :**

تاقیکردنەوە زۆرەکانی مێژوو لەو رۆژەوەی نووسین پەیدا بووە تا ئیمرۆی ئێمە روون‌و ئاشکرا نیشانیان‌داوە تەنها ئەو بەرهەمانە نەمرن کە ئاوازی رازاوەی پڕ لە جۆش بۆ خۆشی‌و ناخۆشی گەل دەڵێن . رۆژگاری رێنیسانس‌و بەسەرهاتە هەمەچەشنەکانی بەڵگەیەکی مێژوویی کەم‌هاوتان بۆ روونکردنەوەی ئەم راستی‌یە .

رێنیسانس بەو سەردەمە دەگوترێ کە ئەوروپای دواکەوتوو هۆشی تێیدا هاتەوە بەر خۆی ( لە سەدەی سیازدەوە تاوەکو سەدەی شازدە ) . ئەو ئاڵ‌وگۆڕە گەورەیە ئەنجامی هەرەس‌هێنانی قۆناغی دەرەبەگی‌و دەست‌پێ‌کردنی قۆناغی سەرمایەداری بوو کە بۆ ئەوساکەی مرۆڤ هەنگاوێکی یەکجار گەورە بوو بۆپێشەوە . دیارە دەبوو بەو پێیەش بیرە دواکەوتووەکانی رۆژگاری دەرەبەگی روو لە نەمان بکەن‌و بیری نوێی گونجاو لەگەڵ ئەرکە تازەکانی کۆمەڵدا جێگەیان بگرێتەوە. ئەوەیش بۆ خۆی فەرمانێکی هەر وا ئاسان نەبوو ، چونکە یاسای ژیان کارێکی ئەوتۆی کردووە هەڵکەندنی رەگ‌و ریشەی چەسپاوی بیری کۆن هەمیشە پێویستی بە هەوڵ‌و کۆششی بێ‌وچان‌و ورد بێ . لە رۆژگاری رێنیساندا جێ‌بەجێ‌کردنی ئەو ئەرکە قورسە کەوتە ئەستۆی پێشرەوی دەستەی رووناکبیری ئەو قۆناغەی ئەوروپاوە(١) .

ئەوساکە سەرتاپای ئەوروپا گیرۆدەی زنجیرەیەك گیروگرفت‌و کێشەی کۆمەڵایەتی‌و ئابووری‌و سیاسیی ناڵەبا[illegible]تبوو . گیروگرفتەکانی وەك دێوەزمە چۆکیان بەسەر سنگی [illegible]مەڵانی خەڵکدا دابوو، سەریان لێ شێواندبوون‌و ژیانیاز[illegible] تاڵ کردبوون بێ‌ئەوەی لە سروشتیان تێ‌بگەن تا بتوانن حۆیانیان لە دەست قوتار بکەن . یەکەم نمونەو بەڵگەمان کڵێسەو پیاوەکانی‌یەتی .

ئایینی عیسایی کە دەوروبەری دوو هەزار ساڵ لەمەوبەر پەیدابوو هە[illegible]وێکی گەورە بوو بەرەو پێشەوە ، لە سەرەتاوە کۆیلەو چەوساوانی ناوچەیەکی گرنگی جیهان دەورەیان‌داو بە گیان پارێزگاری‌یان لێ دەکرد ، کەچی فەرمانڕەوایانی دەوڵەتی رۆمای کۆن‌و دیارە هەر لەبەرئەوەش بە لایەنی کەمەوە سێ سەدە بەرەنگاری هاتن‌و بە هەزار جۆر ویستیان لەناوی‌بەرن . دوژمنایەتی ئایینی عیسایی بە فیڕۆ رۆیی‌و تا دەهات زیاتر رەگی لەناو چەوساواندا دادەکوتاو زیاتر وەك هێزێکی بزوێنەری ژیانی کۆمەڵایەتی‌و سیاسی خۆی دەنواند ، ئەوەی فەرمانڕەوایانی ناچارکرد سەرنجی بدەنێ‌و هەوڵ بدەن کەڵکی لێ وەربگرن .

ئەو راستی‌یە سەرەتای سەدەی چوارەم تێکەڵ بە رووداوێکی ناوخۆ بوو کە پێکڕا بوونە هۆی هەڵگەڕانەوەی هەڵوەستی پاشایانی رۆما بەرامبەر بە کڵێسەو ئایینی عیسایی. ئەوکاتە ، واتە سەرەتای سەدەی چوارەم ، لەسەر تەختی پاشایی دووبەرەکی‌یەکی گەورە لەنێوان چوار دەسەڵاتداری رۆمادا دەستی‌پێ‌کرد . یەکێك لەو چوارە کە ناوی قوستەنتین بوو دروست هێزو توانای گاورەکانی نرخاند ، بۆیەکا خۆی لێ نزیك خستنەوەو پەیمانی دانێ کە ئەگەر بێتو یاریدەی بدەن تاجی شاهی بنێتە سەر ئەوسا ئەویش یەکسانی دەداتە

د . کەمال مەزهەر


دانتێ

ئاینی عیسایی‌و وەك ئاینەکانی‌تر رەفتاری لەگەڵ دەکات . ئەوەبوو قوستەنتین سالی ٣٠٦ بە مەرامی خۆی گەیشت‌و بۆ ماوەی ٣١ ساڵ بە ناوی قوستەنتینی یەکەمەوە پاشایی کرد ( سالی ٣٣٧ کۆچی دوایی کرد ) . قوستەنتین گفت‌و پەیمانەکانی خۆی بردە سەرو ئازادیی بە گاوران بەخشی‌و هەرچی خانوبەرەو زەوی‌وزاری زەوت‌کراوی کلێسە هەبوو بۆی گێرایەوە .

لێرەوە ئاڵ‌وگۆڕێکی زۆر گەورە لە ژیانی کلێسەو رێبازیدا دەستی‌پێ‌کرد . لە سالی ٣٢٥وە عیسایی بووە ئاینی رەسمیی دەوڵەت‌و کلێسە دانی بەوەدا نا کە قوستەنتین سەرۆکی باڵای دین‌و دونیاو نوێنەری عیسای پێغەمبەرە (د.خ. ). هەرچەندە قوستەنتین بۆ خۆی پیاوێکی دڵڕەق‌و خوێنڕێژ بوو ، تەنانەت دەستی چووە گیانی ژنێکی‌و یەکێك لە کوڕەکانی‌و ژمارەیەکی زۆر لە خزمانی‌و هەر لەبەرئەوەش هیچ سەیر نی‌یە ئەگەر بڵێین تا بەر لە مردنی بە ماوەیەکی کەم نەبووە عیسایی .

بەوجۆرە کلێسە تا دەهات زیاتر تێکەڵ بە ژیانی دونیاو سیاسەتی رۆژانەی ئیمپراتۆریی رۆمانی دەبوو کە تەنانەت وا پێوەی لکا سالی ٣٩٥ لەگەڵ دابەش‌بوونی ئەوداو بە دەستووری ئەو ئەمیش بوو بە دوو بەشەوە ــ کلێسەی رۆژئاوایی رۆمانی‌و کلێسەی رۆژهەلاتیی بیزەنتی(٢) . سالی ١٠٥٤ ئەو دابەش‌بوونەی کلێسە بە دروست‌بوونی کلێسەی کاتۆلیکیی رۆژئاوایی‌و کلێسەی ئەرتەدۆکسیی رۆژهەلاتی تەواو چەسپا.

یەکەمیان ، واتە کلێسەی کاتولیکیی رۆژئاوایی ، لە سەرەتاوە شوێنی دیارو کاری گەورە بوو لە جیهانی عیسایدا . سەرۆکی ئەو کلێسەیە لە سەدەی پێنجەمەوە نازناوی « پاپا »ی بۆ خۆی هەڵبژارد کە واتای ( باوك ) دەگەیێنێ ، دەیویست بەو نازناوەی وا رابگەیێنێ کە ئەو باوکی رۆحیی گشت گاورانە . رۆژبەرۆژ دەسەلاتی پاپا فراوانتر دەبوو ، بەتایبەتی دوای ئەوەی سێبەری کلێسە دەرەبەگان‌و فەرمانڕەوایانی لە جاران زیاتر حەواندەوە . کار گەیشت بەوەی میران‌و پاشایان‌و گەورە پیاوانی ئەوروپا رێزیان دەبەست تاوەکو بە ماچ‌کردنی پێی پاپا شاد بین(٣) . یەکێك لە پاشاکانی ئیمپراتۆریی رۆمانی ناچار بوو بە خۆی‌و دەستەو دایەرەیەوە سێ شەوو سێ رۆژی رەبەق بە رووت‌وقووتی لە بەردەمی قاپیی‌کۆشکی پاپادا بووەستێ بۆئەوەی لە زەلەیەکی خۆش بێ!.

بەوجۆرە کلێسە بووە بەشێکی بنەرەتیی رژێمی دەرەبەگی‌و یەکێك لە دامودەزگا هەرە گرنگ‌و کاریکەرەکانی . کلێسەو پیاوانی بە دەستووری دەرەبەگە گەورەکان بە هەزار ناوو بیانووەوە کەوتنە زەوت‌کردنی زەوی‌وزار . تا رۆژی رێنیسانس هەڵهات کار گەیشت بەوەی بە لایەنی کەمەوە سێ‌یەکی زەوی‌یە هەرە بەپیت‌و بەرەکەتەکانی زۆربەی وڵاتانی ئەوروپا بکەوێتە دەست کلێسەو پیاوەکانی‌یەوە کە بە هەمان شێوازی باوی ئەوسای دەرەبەگی کەڵکیان لێ وەردەگرت‌و بگرە جاری‌وا هەبوو ئەوان جوتیارانیان خراپتر دەچەوساندەوە بەوەی تەماعی گوایە مسۆگەرکردنی ئەوە دونیایان پێ‌دەدان . تێکەڵی نێوان کلێسەو دامودەزگای دەرەبەگی وا قووڵ‌بۆوە کە بەر لە رێنیسانس ژمارەیەکی زۆر لە مولکدارە گەورەکانی ئەوروپا هەمان‌کات بوونە کاربەدەست‌و فەرمانبەری گەورەی کلێسە(٤) . با ئەوەیش بڵێین کە ئەوساکە فەرمانبەرو کارگێڕو کاربەدەستانی کلێسە لەشکرێك بوون بۆ خۆیان ، ژمارەیان دەگەیشتە ٧٠٠ هەزار کەس لەکاتێکدا هەموو دانیشتوانی ئەوروپای ئەو سەردەمە بەسەر یەکەوە بریتی‌بوون تەنها لە ٤٦ ملیۆن کەس(٥) . هەمان کات کلێسەو قەشەکانی دەستیان تێکەڵی بازرگانی‌و پیشەسازی کردو کار نەما نەیکەن .

کەوابێ کلێسەو رژێمی دەرەبەگی بوونە گیانێك‌و تەنێك ، لەبەرئەوە کاربەدەستانی یەکەمیان لە رێگەی بیریشەوە کەوتنە خزمەتی دڵسۆزانەی دووەمیان . بۆ جێبەجێ‌کردنی ئەو مەبەستەیان بە دەیان بیروباوەڕی نوێ‌یان بە ناوی ئاینەوە داتاشی کە سەرتاپایان دوورکەوتنەوەی راستەوخۆ بوون لە ماك‌و ناوەرۆکی عیسایی . یەکێك لەو بیروباوەڕە دەستکردە ترسناکانەیان دەیگوت هەرچی لە ژیانی ئیمرۆدایە نەگۆڕەو دەست بۆ بردنی « دەست تێوەردانە لە کاری خودای مەزن ». هەروەها ئەوان وایان بردبووە مێشکی ساکارانەوە کە مرۆڤ بە سروشت تاوانبارەو لە رێگەی کلێسەوە نەبێ هەرگیز بۆی نی‌یە خۆی لە بەندی تاوانەکانی قوتار بکات . وردکردنەوەی ئەو « شەکرانە » مانای نەگۆڕیی رژێمی دەرەبەگی‌و بەستنەوەی خەڵکیان بە کلێسەوە دەگەیاند . بۆئەوەش کە بە درۆ نەکەونەوە فەرمانڕەوایانی کلێسە لە سەرەتای سەدەی سیازدەمینەوە

خوێندنەوەی تەوراتو ئینجیلیان بێ یاریدەی قەشەیەك قەدەغە کرد . واتە ئەوی بیویستایە بەرهەمێکی ئایینیی کۆن بخوێنێتەوە دەبوو پەنا بەرێتە بەر یەکێك لە پیاوانی کلێسە کە ئەویش ،بێ‌گومان ، بە مەرامی دڵی پاپاو کاردینالەکان ناوەرۆکی بۆ لێك‌دەدایەوە . جێ‌بەجێ‌کردنی ئەو فەرمانە بۆ ئەوسای ئەوروپا کارێکی گران نەبوو چونکە پیاوانی کلێسە تاکە دەستەی خوێندەواری کۆمەڵ بوون .

دیسان بەر لە هەڵهاتنی ڕۆژی ڕێنیسانس کلێسە لەڕاستیدا بووە دەولەت. لەناو دەولەتدا ، لەشکری سەربەخۆو دەزگای کارگێڕیو دارایی تایبەتیی خۆی هەبوو، شەڕی هەڵدەگیرساندو تێکەڵ بە شەڕی دەولەتان دەبوو . بەوجۆرەش تا دەهات ئەرکی سەرشانی پەرەی دەسەندو زیاتر ئاتاجی پارەو پوول دەبوو ، بەتایبەتی دوای ئەوەی کە هیچ جیاوازی‌یەك لەنێوان ژیانی سەردارانی ئەوو میرو پاشایانی ئەوروپادا نەما . لەبەرئەوە پاپاو کاردینالەکان هەر ڕۆژەی بەندو باوێکی نوێ‌یان دادەمەزراند تا زیاتر گیرفانیان بە زێڕ بئاخنن. لەوەدا قەشەو پیاوە ئایینی‌یە پچوکەکانی‌تریش پڕبەدڵ پشتگیری‌یان دەکردن چونکە بایەخدانی ئەوانیش بە ژیان گەیشتبووە ڕادەیەکی ئەوتۆ بەدەگمەن ، وەك سەرچاوە باوەڕ پێکراوەکان باسی‌دەکەن ، توخنی کلێسەو کاری ئایینی دەکەوتن(٦)

مشتێکی زۆر پچوك نمونەیەکی زۆر گەورەی ئەو خەروارەیە . پاپاکان ئاشکرا کەوتنە فرۆشتنی نازناوو پایە ئایینی‌یەکان ، ئەوی زۆرتری بدایە شوێنێکی چاکتری بەردەکەوت ، جا خوای دەکرد ئەوکەسە دز یا جەردەو پیاوکوژ دەبوو . پاپاو کاردینالەکان بەوەشەوە نەوەستان ، بەڵکو زۆر بێ‌شەرمانە دەستیان دایە فرۆشتنی « نوشتەی تاوان ڕەوێن » ( صك الغفران ) کە لە کۆتایی سەدەی یازدەدا بۆ هاندانی گاوران بۆ بەشداری‌کردن لە شەڕی خاچداراندا داهات ، بەڵام ئەوسا کلێسە بە مفت دەیدایە خەڵکی نەك بە پارە . کەچی زۆری نەبرد سەردارانی کلێسە « نوشتەی تاوان‌ڕەوێنیان » خستە بازاڕی ڕەشەوەو کەوتنە فرۆشتنی ، کەم کاری‌تر بەڕادەی ئەو کارە بووە هۆی بەرەڵابوونی جڵەوی خراپەو خراپەکاری لە ئەوروپادا،بەتایبەت لەنێوان پارەداراندا چونکە بەپێی فەرمایشتی پیاوانی کلێسە هەرکەس دەیتوانی بەر لە مردن لێخۆشبوونی یەزدان لە تاوانەکانی بە کڕینی یەکێك لەو نوشتانە بنیات بنێ . سەیر ئەوەیە پاپا دەیفەرموو ئەو نوشتانە تا نرخیان نەدرێ ناکەونە کار(٧) . بەر لە ڕێنیسانس کار گەیشت بەوەی خەڵکی بتوانن « نوشتەی تاوان‌ڕەوێن » بە قیست یا بۆ بەشێك لە گوناهەکانیان بکڕن . بەڵام تەنانەت ئەوەیش بەرچاوی پیاوە ئایینی‌یە گەورەکانی نەگرت ، بۆیەکا بەندێکی نوێ‌یان هێنایە کایەوە بگۆەی « مافیان » دا بە هەرکەسێك بیەوێ لێخۆشبوونی یەزدان لە تاوانی مردۆکانی بە کڕینی نوشتەیەك لەو نوشتانە مسۆگەر بکات(٨) ، واتە ئەوساکە کوڕی هەر ستەمکارێك بۆی هەبوو بە پارە بە ئەوپەڕی ڕێزەوە باوکی ڕەحمەتیی لە دۆزەخەوە بگوێزێتەوە بۆ بەهەشت . نەوەی جەنگیزخانو هۆلاکۆو تەیمووری لەنگ لەبەرئەوەی پارەدار بوون دەیانتوانی بەهەشت بۆ ئەوانو بۆ خۆیشیان قۆرغ بکەن . « زۆڵە » زرینگەکانی ئەو ڕۆژگارە دەیانگوت :

« خواوەندی گەورە حەز بە مردنی تاوانبار ناکات، دەیەوێ بژی‌و هەر پارە بدات »(٩) .

ئەمەش بەشێك لە ناوەرۆکی یەکێك لەو نوشتانەیە کە دەیگوت :

**« ... یەکەم لە گشت لۆمەیەکی ئایینی بە هەر جۆرو شێوازێك دووچاریان هاتبیت ڕزگارت‌دەکەم ، ئینجا لە هەموو تاوانەکانتو لە سەرتاپای ڕابواردنەکانت چەند زۆرو گەورە بن ...بەپێی دەسەڵاتی پیرۆزی کلێسە لە هەر سزایەك کە لە ئەعرافدا(١٠) لەسەر ئەو گوناهانە دەبێت بیچێژیت قوتارت دەکەمو دەتگێڕمەوە ئەو ڕۆژەی تێیدا کۆرپەیەکی پاكو خاوێن بووی . لەبەرئەوە کە کۆچی دواییت کرد دەرگەی ئازارت لێ دادەخرێو دەرگەی خۆشی‌و بەهەشتت بۆ دەکرێتەوە ... ».**

دێرەکانیش کە سەرەتای پەیدابوونیان جێگەی برایەتی‌و یەکسانی بوون لە سەدە ناونجی‌یەکاندا بوونە سەرچاوەیەکی‌تری پارە هەڵڕشتن بەسەر پیاوە ئایینی‌یە گەورەکاندا . بۆئەوەی زەوی‌و زاری کلێسەو مولکەکانی لەدەست‌نەچن جەنابیان وایان بە باش زانی قەشەکان تا دەمرن « بوخچەی نەکراوە » بن ، ئافرەتیان شوو نەکاتو پیاویان ژن نەهێنێ . ئەوەش بۆ خۆی دێرەکانی ئەوسای کردە جێگەی خراپەو ڕابواردن . یەکێك لە پاپاکانی ئەو ڕۆژگارە کە ناوی ئەنۆسێنتی سێیەم بوو ( ١١٩٨ــ ١٢١٦ ) بۆ خۆی لە بەڵگەیەکیدا دەربارەی « دێری ئاگاثا » نووسیویە دەڵێ ئەو دێرە «گشت ناوچەکەی پیس‌کردووە». سەرچاوەیەکی‌تری ئەوسای کلێسە باسی ئافرەتێکی کردووە کە کارگێڕی یەکێك لە دێرە گەورەکان بووەو دەڵێ « شەو نەبوو خۆی بە مەی کاس‌نەکات » . بەڵگەیەکی‌تری کلێسەی هەر ئەوسا باسی ئافرەتانی ناو دێرێکی ئینگلیزی بەمجۆرە تۆمار کردووە : ئەوان گوێ‌یان نەدایە فەرمانی پاپا کە دەیگوت دەبێ دەست لە بەرەڵلایی هەڵگرن ، دوای ئەوەی فەرمانەکەی پاپایان دایەوە بە دەموچاوی ئەو قەشەیەدا کە بۆی هێنابوون « سوێندیان خوارد تا مردن دەست لە ڕابواردن هەڵنەگرن »(١١) .

هەموو ئەوانەی باسمان‌کردن‌و گەلێك لایەنی‌تری ژیانی وەك ئەوان بوونە هۆی دروست‌بوونی ناڕەزایەکی زۆر لەناو کۆمەڵانی خەڵك‌و بەتایبەت لەناو ڕووناکبیرە دووربینەکانی ئەو ڕۆژگارەی ئەوروپادا کە کەوتنە ڕەخنەگرتن لە کڵێسەو پیاوانی ئایینی‌و ڕەفتارە ناهەموارەکانیان . ئەو ناڕەزایی‌یە هەندە جارێك شێوەی بزوتنەوەی وەردەگرت . دیارە فەرمانڕەوایانی کڵێسەش دەستەوەسان نەوەستان ، دەستوبرد کەوتنەخۆ بۆ لێدان‌و دامرکاندنەوەی چالاکی‌یەکانی ناحەزانیان کە بوبونە یەکێك لە نیشانەو بەڵگەکانی هەرەس هێنانی سەرتاپای ڕژێمی دەرەبەگیی ئەوسای ئەوروپا. ئەوەبوو لە سەرەتای سەدەی سیازدەمینەوە دەستیان‌کردە دامەزراندنی دادگەی تایبەتیی سەر بە خۆیان کە بە ناوی دادگەکانی پشکنینەوە(١٢) ناسراون . هیچ مێژوونووسێك نی‌یە ئیمڕۆکە ڕاستەوخۆ دان بەوەدا نەنێ ئەو دادگایانە لاپەڕەیەکی ڕەش‌و سیای ئەو قۆناغەی ئەوروپان کە مێژوو کەم لە هاوتایانی بەخۆیەوە بینوە .

**دادگەکانی پشکنین بە نهێنی کاریان دەکرد ، خراپترین جۆری ئازاردانیان بەکار دەهێنا . ئازاردەرانی دەستەیەکی نەزان‌و نەفام‌و چاوبرسی بوون ، کلێسە وای بردبووە مێشکیانەوە کە گوایە بەوکارەیان بەهەشتی پڕ لە مەی‌و پەری بۆ خۆیان‌و نەوەیان بنیات دەنێن . هەروەها بەشێك لە سامانی ئەوانەی دەکەوتنە بەردەستیان‌و بە زەبری قامچی ناچار دەبوون خۆیان بە تاوانبار دابنێن بەر ئەوان دەکەوت . لەبەر ئەوە زۆر بە دەگمەن هەبوون بتوانن تا سەر دان بە خۆیاندا بگرن . جاری‌وا هەبوو ئازاردانیان چەندساڵێکی دەخایاند . بە وێنە زانای گەورە جۆردانۆ برۆنۆ (١٥٤٨ ــ ١٦٠٠) هەشت ساڵی ڕەبەق لەو ئازارەی چێشت .**

بەوجۆرە بە سەدان هەزار ڕۆڵەی دڵسۆزی ئەوروپا بوونە قۆچی قوربانیی دادگە دواکەوتووەکانی پشکنین . سەیر ئەوەیە ئەوانەی تاوانبار دەکران سەریان نەدەپەڕینرا وەك ئەوسا لە ئەوروپا باو بوو ، بەڵکو دەسووتێنران گوایە لەبەر ئەوەی کڵێسە بەخێرێ دژی خوێن ڕشتن بوو ! . هەروەها بەپێی فەرمانی پاپا دەبوو دەزگاکانی میری «تاوانبارەکان» بسووتێنن چونکە کڵێسە بۆ خۆی دەستی نەدەچووە گیانی خەڵکی !! . هەرکەسیش تاوانبار دەکرا نەوەی لە سامانی بێبەری دەکراو کڵێسەو پیاوەکانی دەبوونە وەچەی !!! زۆری نەبرد بەپێی بڕیارێکی تایبەتی دادگەکانی پشکنین مافی «سزادانی» مردوانیشیان وەرگرت‌و کرێگرتەکانیان زۆر بێ شەرمانە گۆڕی هەزارانیان هەڵتەکاندو پاشماوەی ئێسك‌و پروسکی لاشەکانیان سووتاندن‌و بەو بیانووەوە کەوتنە زەوت‌کردنی هەر خانوبەرەو زەوی‌وزارێك بەناویانەوە بەجێمابوون .

لەبەرئەوانەی باسمان‌کردن هیچ سەیر نی‌یە کاتی خۆی خەڵکی نازناوی «خوێن ڕێژ»یان بۆ ژمارەیەك لە پاپاکان هەڵبژاردبوو ، وەك ئەسکەندەری شەشەم (١٤٩٢ ــ ١٥٠٣) کە ناشیرینیی ڕەفتارەکانی کارێکی ئەوتۆی کرد هەموان ، بە کاتۆلیك‌و پرۆتستانت‌و بەئیمان‌و بێ‌ئیمانەوە زۆر بەتوندی ڕەخنەی لێ بگرن‌و لۆمەی بکەن(١٣) . داهاتی ئەو پاپایە خۆی لە نزیکەی دوو ملێون دۆلار دەدا(١٤) کە سەدان ملیۆنی ئیمڕۆی دەکرد .

دەستەو دایەرەی پاپا لەکوێ بۆیان بلوایە لەوێ زیاتریان بە خەڵك دەکرد . ئەوەی لە ئەڵەمانیای دابەش دەیانکرد بە کتێبیش تەواو نابێ . لێرەدا تەنها یەك نموونەی مانادار دەهێنمەوە . پیاوە ئایینی‌یەکانی ئەوسای ئەو وڵاتە باجیان لە مەیخانەو لە کارخانە وەردەگرت‌و تەنانەت پاکانەیان بۆ ئافرەتی بەڕەڵلا دەکردو دەیانفەرموو تاوانی ئەوانەش کە دەچنە باخەڵیان لەو بابەتەیە کە یەزدان بە ئاسانی لێی خۆش‌دەبێ . لەبەرئەوە هیچ سەیر نی‌یە لە سەدەی چواردەو پازدەمیندا نەخۆشیی سووزەنەك لە ئەڵەمانیادا بەجارێك تەشەنەی سەندو کەوتە دروێنەی گیانی دەیان هەزار کەس .

سەرباری گشت ئەمانە کڵێسە بەئاشکرا دژی بزوتنەوە نەتەوەیی‌یەکان‌و پەیدا بوونی زمانی ئەدەبیی یەکگرتوو بوو چونکە هەردووکیان دەبوونە هۆی وریابوونەوەی جەماوەرو کەم‌بوونەوەی دەسەڵاتی خۆی . هەر لەبەرئەوەش کڵێسە دژی بڵاوبوونەوەی خوێندن‌و خوێندەواری‌ی بوو ، سەرەتا بەربەرەکانی‌یەکی زۆری چاپخانەی نوێی کردو لەوساوە دەستی دایە بڵاوکردنەوەی لیستەی تایبەتی بۆ ناوی ئەو بەرهەمە ئەدەبی‌و زانستی‌یانەی لای پەسند نەبوون‌و لەبەرئەوە قەدەغەی دەکردن .

بە هەمان دەستوور ئەوروپای بەر لە ڕۆژگاری ڕێنیسانس دووچاری زنجیرەیەکی‌تر گیروگرفت‌و کێشەی کۆمەڵایەتی‌و ئابووری‌و سیاسیی تێکهەڵکێش هاتبوو . ڕژێمی دەرەبەگی‌و شێوازی چەوساندنەوەی ئەو ڕژێمەو ئەنجام‌و دیاردەکانی بوبونە کۆسپێکی گەورە لە بەردەم ڕەوڕەوەی پێشکەوتنی گشت گەلانی ئەوسای ئەوروپادا . بادەی خۆشی ناو کۆشك‌و قەڵا گەورەکانی دەرەبەگەکانی ئەوسا بە خوێن‌و فرمێسك‌و ئارەقی ناوچەوانی هەژاران دەگەڕا . لێرەشدا مشتێکی زۆر پچوك نمونەی خەروارێکی زۆر گەورەیە . جوتیارانی سەدە ناونجی‌یەکانی ئەڵەمانیا دەبوو پاش مردنیش باج‌و سەرانە بدەنە ئاغا زیندووەکانیان . نەوەی ئەو مردوانە

مافیان نەبوو دەست بۆ ئەو میراتە بەرن کە بۆیان دەمایەوە بەرلەوەی سێ یەکیان لەگەڵ مشتێك پارەدا پێشکەش بە ئاغا دەکرد . ئەو باجە ناوی خۆی بە خۆیەوە بوو ــ «مردووانە» .

چەوساندنەوەی بێ ئەندازە جوتیارانی ئەورووپای لە ژیان وا وەڕس کرد کە بەر لە کۆتایی سەدە ناونجی یەکان بە صەدان هەزاریان ناچاربوون لە زۆر ناوچەو مەڵبەندا پەنا بەرنە بەر چەك . ساڵی ١٥١٧ نزیکەی ٩٠ هەزار جوتیاری ستیریا لە ئەڵەمانیا بۆ ماوەی سێ مانگ لەسەر یەك بێ وچان کەوتنە پەلاماردانی کۆشك و تەلاری ئاغاکانیان . ژمارەی تەنها قوربانی یەکانی شۆڕشی گەورەی جوتیارانی ئەڵەمانیا لە ساڵی ١٥٢٤ ــ ١٥٢٥دا خۆی دەدا لە نزیکەی صەد هەزار کەس[١٥]. بۆئەوەی باشتر لە هۆو ئامانجەکانی ئەو جۆرە ڕاپەڕین و شۆڕشانە تێبگەین کورتەی ناوەرۆکی ئەو «خەوە» دهێنینەوە کە گوایە شوانێکی ئەوساڵانە بینیوی یە . ساڵی ١٤٧٦ هانز کە شوانێکی ئەڵەمانی بوو ڕای گەیاند گوایە «دایکی یەزدان هاتۆتە خەوی و پێی گوتووە دەسەڵاتی ئاسمان بۆ سەر زەمین نزیك بۆتەوەو ئیتر نە پاشاو نە میرو ئاغاو نە پاپا ناویان لەناو ناواندا نامێنێ و هەموو پیاوان دەبنە براو ئافرەتانیش دەبنە خوشکی یەکترو وەك یەك دەبنە خاوەنی زەوی وزارو لەوەڕگەو بێستان و دارستان ... » . ئەو «خەوە» خۆشە بەس بوو بۆ ئەوەی بە هەزاران دووی هانز کەون .

لەژێر سایەی ڕژێمی دەرەبەگیدا زۆربەی وڵاتانی ئەوروپا دابەش و لێك دابڕاو بوون . ئەڵەمانیا ، بەوێنە ، ئەوساکە لە دەیان میرنشینی دوژمن بە یەك پێکهاتبوو . شارە گەورەکانی ئیتالیاش هەر یەکەیان دەوڵەتێك بوو بۆ خۆی . هەر بەوپێیەش لە سەرتاپای ئەوروپادا زمانێکی ئەدەبیی یەکگرتوو نەبوو . زمانی وا هەبوو لە دە دیالێکت و پتر دروست بوبو . چین و دەستەکانی سەرەوەی کۆمەڵ بە لاتینی دەدوان و هەر ئەویشیان بۆ نووسین و خوێندن بەکاردهێنا . لەناو کۆمەڵانی خەڵکدا دەبوو بە چرای ڕۆن گەرچەك بەدوای کوێرە خوێندەوارێکدا بگەڕایتایە . ڕشانەوەو لەرزوتاو ئاولەو سورێژەو دەیان نەخۆشیی تری وەك ئەوان شان بەشانی برسێتی دروێنەی ژیانی هەزارانیان دەکرد . تەنها ئەو ڕشانەوەیەی ساڵی ١٣٤٨ لە چەند مەڵبەندێکی ئەوروپادا بڵاوبۆوە بووە هۆی مردنی صەدان هەزار کەس .

بەوجۆرە کڵێسەو ڕژێمی دەرەبەگی بەگشتی بوونە کۆسپ لە بەردەم هەموو پێشکەوتنێکی نوێدا . سەرەتاو ناوەندی سەدە ناونجی یەکان ئەوە بۆ ڕژێمی دەرەبەگی و تایبەت بۆ کڵێسە لوا ، بەڵام لە کۆتایی ئەو قۆناغە مێژوویەدا ئیتر بۆی نەدەلوا چونکە لە مناڵدانی کۆمەڵگای ئەوساکەی ئەوروپادا هێزو دەستەی نوێ دروست بوون کە دوارۆژیان لە هیچ ڕوویەکەوە لەگەڵ ڕژێمی دەرەبەگیدا نەدەگونجا ، ئەوەی بووە هۆی پەیدا بوونی بیری نوێ کە بێ بەزەییانە کەوتە ئابڕو بردنی بیرە دواکەوتووە باوەکانی ئەو ڕۆژگارە تاریکە . دەبوو نەشتەری تیژی ڕووناکبیرانی مەڵبەندە پێشکەوتووەکانی ئەوسای ئەوروپا بەر لە هەموان بکەوێتە دادڕینی پەردە ڕەشە دەستکردەکانی کڵێسە . شاعیرو نووسەری گەورەی ئیتالیاو جیهان دانتێ یەکەم کەس بوو دەنگی زوڵاڵی بەرزکردەوەو پەردەی ڕاماڵی و گشت ئەوروپای هەژاند .

## دانتێ و کۆمێدیای یەزدانی :

**« هەزار ساڵی ژیان لە ئاستی نەمریدا تروکەیەکە »**

**ــ دانتێ ــ**

بەهاری ساڵی ١٢٦٥ دانتێ ئەلیجیری لەناو خێزانێکی دێرین و ناسراوی فلۆرەنسەدا لەدایك بوو[١٦]. لە هەرەتی لاویدا تێکەڵ بە ژیانی پڕ لە چالاکیی سیاسی و کۆمەڵایەتی فلۆرەنسە بوو کە ئەوساکە لە هەموو شارەکانی ئیتالیاو ئەوروپا بەناوبانگ و پێشکەوتوتر بوو[١٧] . دانتێ لایەنی «پارتی سپی یان»ی گرت کە لە بازرگان و صەنعەتکارانی فلۆرەنسە پێکهاتبوو ، ئەوانەی ئەوسا دەستەیەکی زۆر پێشکەوتووی کومەڵگای ئیتالیایی بوون . ساڵی ١٣٠٢ کاتێك ناحەزانی ئەوان کە بریتی بوون لە میرو ئەرەستۆکراتی ئەوساکەی شارو بە ناوی «پارتی ڕەشان»ەوە ناسرابوون دەسەڵاتیان وەرگرت فەرمانی هەڵواسینی دانتێیان دەرکرد ، بەڵام بەوەی باش بوو لەوکاتەدا دانتێ لە دەرەوەی فلۆرەنسە بوو بۆیەکا ، بۆ بەختی هەموان ، بەردەست نەکەوت . لەگەڵ ئەوەش کە دانتێ وازی لە سپی یەکان هێناو وەك خۆی دەیگوت «خۆم بوومەتە پارتی خۆم»، ئینجا پاش سیازدە ساڵ کاربەدەستانی فلۆرەنسە دیسان فەرمانی خنکاندنیان دەرکردەوە بۆیەکا تا مردن نەیتوانی جارێکی تر بە فلۆرەنسەی خۆشەویستی شاد بێتەوە هەرچەندە بێ سوود تەقەلایەکی زۆری دا بۆئەوەی دەستی لێ هەڵبگرن و ڕێگەی گەڕانەوەی بدەنێ . کە ئەوەی بۆ نەلوا کەوتە گەڕان بەو شارو مەڵبەندانەی ئیتالیاداکە سەر بە فلۆرەنسە نەبوون[١٨] . لەو ساڵانەدا زۆر جار دووچاری نەبوونی و گێرمەو کێشە هات . دانتێ دوا شەش ساڵی ژیانی لەشاری ڕاڤنا بردە سەر تا ڕۆژی چواردەی ئەیلولی ساڵی ١٣٢١ چاوی لێك ناو هەر لەوێش نێژرا . شایانی باسە کاربەدەستانی ئیتالیا ساڵی ١٩٦٦ ، واتە پاش تێپەڕ بوونی

٦٤٥ سالی ڕەبەق بەسەر کۆچی دوایی دانتێدا فەرمانی خنکاندنەکەیان هەڵوەشاندەوە .

دانتێ پیاوێکی ساکارو هێمن ، لەسەرخۆو کەمدوو بوو ، زانایەکی یەکجار زیرەکو خوێندەوارو ورد بوو ، لە سەرتاپای ئەورووپای ئەو ڕۆژگارەدا کەسێك نەبوو شان بدا لە شانی . کاتێکیش ئەو تێکەڵ بە کۆڕی ژیان بوو ئیتالیای نیشتمانی گەیشتبووە ڕۆخی ئاڵوگۆڕێکی ئابووریو کۆمەڵایەتیی گەورە کە زۆر ئاتاجی لێشاوی شەپۆلێکی فراوانی بیر بوو بۆ ڕامالینی کۆنو چەسپاندنی نوێ . بێ ئەو شەپۆلە ڕەورەوەی ژیانو مێژوو بە تەکانیش نەیدەتوانی هێدی بەرەوپێش بڕوا . دانتێی نوورو وردبین یەکەم کەس بوو دروست دەرکی ئەو ڕاستییە گرنگو بایەخدارەی کرد .

بەر لە هەموان دانتێ هەستی بەوە کرد کە دەبێ ئەدیب بۆ گەل بنووسێ ، کەوابێ دەبوو هەر بەو زمانەش بنووسێ کە هەموان ، نەك دەستەیەکی تایبەتی ، لێی تێدەگەیشتن . ئەو بۆچوونە شۆڕشێکی گەورە بوو بۆ کۆتایی سەدەی سیازدەمین کاتێك ڕووناکبیرانی ئەورووپا بە لاتینی بەرهەمی خۆیان بڵاودەکردەوەو نووسین بە زمانی نەتەوەیی بەلایانەوە پەشمو نزمی بوو . ئا لەوکاتەدا دانتێ خولیای زمانی ئیتالیایی دای لە کەلەیو بەپەرۆشەوە کەوتە سۆراخی دیالێکتەکانی(١٩). زۆری نەبرد دەستی دایە دانانی بەرهەمی تایبەتی دەربارەی زمانی نەتەوەیی کە دەیگوت وەك «نانی جۆ» بۆ هەموانە نەك بۆ دەستەیەکی پچوکی تایبەتی(٢٠). شایانی باسە دانتێ ئەو بەرهەمانەی بە زمانی لاتینی دادەنا چونکە دەیویست لە ڕێگەیانەوە پاڵ بە نووسەرانی ئیتالیاوە بنێ بە زمانی زگماکی خۆیان بنووسنو سووریش دەیزانی کەسێکیان بێزیان نایەت تۆخنی ئەو بەرهەمانەی بکەون ئەگەر بە لاتینی نەنووسرێنەوە . هەرچی بەرهەمەکانی تری بوون دانتێ بە زمانی نەتەوەیی دایدەنان چونکە دەیویست لە ڕێگەیانەوە بکاتە قوڵایی هەستو دەروونی زۆرینەی گەل . لە ڕێگەی هەردووکیشیانەوە ، واتە لە ڕێگەی بەرهەمە لاتینییەکانیو ئەوانەیان کە بە زمانی ئیتالی دایدەنان ، توانی زۆر زوو کار بکاتە سەر دەستەیەك ڕووناکبیری ئەوسای ئیتالیا کە وایان لێهات ، بەپێی گوتەی خۆیان ، لە « شیرینی شێوازی نووسینی نوێ تێبگەن»(٢١) .

بەو جۆرە دانتێ ئەلیجیری یەکەم بەردی گەورەی لە بناغەی دامەزراندنی زمانە ئەدەبییە یەکگرتووەکانی ئەورووپادا دانا کەبوونە قەڵغانی پاراستنو گەشە پێکردنی هەستو هۆشی نەتەوەییو چەکی کاریگەری ڕیسواکردنی کۆنو بنیاتنانی نوێو پێشخستنو بڵاوبوونەوەی ئەدەبی نەتەوەیی کە وەك نانی جۆی ئەو ڕۆژگارە بووە خۆراکی هەموان . ئەو ئامانجە بەرزو ڕەوایانە وایان لە دانتێ کردبوو بەتوندی پەلاماری ئەوانە بدات کە خۆیوتەنی «هەوڵ دەدەن لە نرخی زمانە نازدارەکەمان کەمبکەنەوە » . بەڵام هەر بۆ خۆیشی زۆر زوو سەلماندی چۆن دەتوانرێ بە دروستی تەنانەت مەبەستی فەلسەفیش لە دوو توێی زمانی نەتەوەییدا ڕابگەیێنرێ . بۆیەکا زۆری نەبرد دڵسۆزێك نەما بیەوێ گوێ بۆ ئاوازی قەڵبو ناهەمواری ئەو جۆرە کەسانە ڕایەڵبکات . هەموو وایانلێهات ، لە « شیرینی زاری خۆیان تێبگەن » .

یەکێك لە بەرهەمە زووەکانی دانتێ ناوی « ژیانێکی نوێ»یە کە دەورووبەری سالی ١٢٨٣ ــ ١٢٩٥ بە زمانی ئیتالی ، نەك لاتینی ، دایناوە(٢٢). لەو بەرهەمەیدا دانتێ بە شیعری ڕازاوە یادی یەکەم خۆشەویستیی خۆی دەکاتەوە . ئەو خۆشەویستییەی لە تەمەنی نۆ سالیدا کتوپڕ هەستی پێ کردو تا مردن لە کۆڵی نەبۆوە . لەو تەمەنەیدا دانتێ بۆ یەکەم جار کچێکی شۆخی لە خۆی گەورەتری بە ناوی پاتریس پۆرتیناریەوە بینیو بە تیری عەشقی گرفتار بوو. هەرچەندە پاتریس نەبزوا ، بەڵکە گاڵتەشی بە دانتێ دەهاتو مێردی بە دەولەمەندێك کردو لە هەرەتی لاویدا چاوی لێکنا . بەڵام بەهۆی خۆشەویستیی ڕەسەنی ئەوەوەو لە ڕێگەی بەرهەمەکانییەوە چۆتە خانەی نەمرانەوە . ڕاستە دڵی ناسکی دانتێ بە لووت بەرزیو زیاتر بە مردنی پاتریس گەردی لێ نیشت ، بەڵام ئەوەمان بەخێر بۆ گەڕا چونکە دانتێی زیاتر خستە سەر ڕێگەی خوێندنەوەو پشکنینو نووسین کە دەیویست بەهۆیانەوە خەفەتی قووڵایی دەروونی بڕەوێنێتەوە.

ناوەرۆکی «ژیانێکی نوێ» زۆر لە چوارچێوەی تەسکی خۆشەویستی فراوانترە . دانتێ لەو بەرهەمەیدا گەلێك ڕووی ژیانی ئیتالیای دەورووبەری کۆتایی سەدە ناونجییەکانو فۆلکلۆرو ئەدەبی ئەوسای تۆمارکردووە . لە هەمووشی گرنگتر ئەوەیە دانتێ بە « ژیانێکی نوێ » زەنگی دەستپێکردنی قۆناغێکی نوێی بۆ نووسینی ئەدەبیی ئەورووپا لێدا ، نیشانیدا چۆن ئەدیب دەتوانێ بە زمانی نەتەوەیی خۆی هەستو نەستی ڕووداوێکی ئاسایی ڕۆژانەی مرۆڤ ڕاگەیێنێ . بەوجۆرە سەرەتای قوتاربوونی ئەدەب لە کۆتو زنجیری ژەنگاویی سەدە ناونجییەکان دەستیپێکرد ، لەوساوە ئەو هونەرە گەورەیەی مرۆڤ سەری لە کۆڕی تەسکی ناو کۆشکو دیواری بڵندی قوتابخانە تایبەتییەکان دەرهێناو ڕووی دەمی کردە هەموان . ئەو دەسکەوتە یەکێك بوو لە دیاردە گەورەکانی ڕێنیسانسو بووە هۆیەکی گرنگ لەو هۆیانەی ڕێگەیان بۆ ئاڵوگۆڕە شۆڕشگێڕییە قووڵەکانی ئەورووپاو دوای ئەو جیهان خۆشکرد .

**پاش دەورووبەری دوازدە ساڵ دانتێ شاکاری «کۆمێدیای**

**یەزدانی »ی پێشکەش بە ئیتالیاو ئەوروپاو گشت جیهان کرد کەیەکێکە لە بەرهەمە ئەدەبی‌یە دانسقە نەمرەکانی مرۆڤ . وایی‌دەچێ دانتێ ساڵی ١٣٠٧ دەستی بە دانانی « کۆمیدیای یەزدانی » کردبێ . گەر ئەو ساڵە دروستبێ ئەوا بە چوارده ساڵ لە دانانی هەر سێ بەشەکەی کۆمیدیا بۆتەوە چونکە ساڵی تەواو بوونی کە ( ١٣٢١ )ە بە دروستی زانراوە .**

«کۆمیدیای یەزدانی» کە گەورەو بەناوبانگترینی بەرهەمەکانی دانتێ‌یە لە سێ بەش پێکهاتووە : «دۆزەخ »و « ئەعراف »(٢٣)و « بەهەشت » . هەر بەشەشیان بریتی‌یە لە ٣٣ سروود کە هەموویان بەسەر یەکەوە پتر لە چوارده هەزار بەیتی ڕازاوە پێکدەهێنن .

دانتێ بە زمانی نەتەوەیی « کۆمیدیای یەزدانی »ی داناوە چونکە ئەو باسانەی لەوێدا هێناونی‌یەوە گشتین‌و وەك دوایی لێ‌یان دەدوێین زۆر بەوردی دەردەکانی کۆمەڵی پێ بیرازکردوون .. لە بەکارهێنانی زمانی نەتەوەییدا دانتێ وەستایی‌یەکی گەورەی نواندووە کە دیالێکتی ڕەخسیوی تۆسکانیی کردۆتە بناغەو بە وشەی هەڵبژاردەو لەباری دیالێکتەکانی تری زمانی ئیتالی زاخاوی داوەتەوەو تەواو دەوڵەمەندی کردووە . هەروەها سروودەکانی کۆمیدیای بە پەندی پێشنیان‌و قسەی نەستەقی باوو باپیران‌و فۆلکلۆری باوی ناو کۆڵانان ڕازاندۆتەوە . بەوکارەی دانتێ سامانێکی زۆری لە کەلەپووری دەوڵەمەندی گەلەکەی لە فەوتان ڕزگارکرد کە بەوهۆیەوە تا ئیمڕۆکەش بەروبووی زۆری ئەو سامانە وان لەسەر زاری ئیتالیایی‌یەکان . سەرباری ئەوانەو هەر بەهۆیشیانەوە دانتێ بووە یەکەم کەس کە بناغەی زمانی ئەدەبی نەتەوەیی یەکگرتووی بۆ گەلی ئیتالیا داڕشت .

« کۆمیدیای یەزدانی » پڕی‌یە لە وردەکاریی وەستایەکی هونەرمەند ، هیچ دەسکەوتێکی ئەدەبی‌و ڕووناکبیریی ڕابوردوو نی‌یە دانتێ تێکهەڵکێشی بەرهەمەکانی‌و لە سەروو هەموویانەوە کۆمیدیاکەی نەکردبێ ، هەرکەس بیەوێ تەواو لە ناوەرۆکی « کۆمیدیای یەزدانی » تێ‌بگات دەبێ تا ڕادەیەکی باش شارەزای ئەلـەفەو ژیانی کۆمەڵایەتی‌و سیاسی‌و مێژووی پێش سەدەی سیازدەمین بێ . بەپێی قسەی شارەزایان ڕۆژئاوایی‌یەکان بۆ تێگەیشتنی جیهانی پان‌و بەرینی دانتێ‌و وەرگێڕانی«کۆمیدیای یەزدانی » پێویستیان بە ١٥ تا ٢٥ ساڵە(٢٤) . لەبەرئەوە هیچ سەیر نی‌یە لە دەزگا زانستی‌یەکانی وڵاتە پێشکەوتووەکاندا تاوەکو ئێستەش کۆڕی تایبەتی بە لێکۆڵینەوەو لێکدانەوەی بەرهەمەکانی دانتێوە خەریکن کە کۆمیدیا ، وەك گوتمان ، شاکاریانە .

ئەوانەی باسمان‌کردن بێ‌گومان هەموویان گرنگ‌و بایەخدارن‌و دەنگ‌دانەوەی ئەرکەکانی قۆناغن‌و لەبەرئەوەش بە ڕەوایی پایەی « کۆمیدیای یەزدانی »یان بەرزکردۆتەوە . لەگەڵ ئەوەشدا لایەنێکی زۆر گرنگتر لەوان لە ناوەرۆکی کۆمیدیادا وەك تەوژم خۆ دەنوێنێ . وەك گوتمان دانتێ لەو بەرهەمەیدا وەستایانە پەردەی لە ڕووی هەموو کەموکورتی‌و ناتەواوییەکانی کۆمەڵ ڕامالیوە . لە کۆمیدیادا گوایە بە خەو دەچێتە جیهانی پاش مردن‌و سەرەتا دەگاتە دۆزەخ . لە یەکەم سروودی دۆزەخەوە دانتێ کەوتۆتە پەلاماردانی ئەو پاپاو کاردینال‌و قەشانەی لە ژیاندا خراپەیان کردووەو نوشتەی تاوان ڕەوێنیان فرۆشتووەو خزمەتی نیشتمان‌و گەلیان نەکردووە ، ئەوانەی بە چاوبرسی‌و خۆفرۆش ناوی‌بردوون‌و لە ڕیزی دزو جەردەو دڵڕەقانی جیهاندا دایناون‌و سەرەو ژێر هەڵیواسیون‌و ئاگری دۆزەخی بۆ کردوونەتە لانەی هەتایی . لە سروودی نۆزدەمینی دۆزەخدا ، بەوێنە ، توشی پاپا بۆنیفاتشۆی هەشتەم دێ‌و بێ‌سڵ‌کردنەوە بە تاوانبارو بەرتیل‌خۆرو خائین‌و جەردەی کلێسەو دوژمنی نیشتمان ناوی دەبات ، بۆنیفاتشۆ لای دانتێ « پەڵەی شەرم‌و نزمی‌یە بە ناوچەوانی سەرتاپای‌مرۆڤەوە » . دانتێ تەنانەت ئاشکرا ناوی کلێسەش دەباو لە سروودی سیودووەمینی ئەعرافدا ئافرەتێکی خراپی کردۆتە دروشمی .

« کۆمیدیای یەزدانی » بە تەرازوویەکی ورد زۆربەی گەورەپیاوانی کلێسەی نرخاندووە ، کەمترین چاکەی بۆ تۆمار کردوون‌و پاداشتی لەسەر داونەوە. بەوێنە ئەدریانی پێنجەمی لە ئەعراف لە نزیك بەهەشتەوە داناوە(٢٥) تەنها لەبەرئەوەی کە بۆتە پاپا ئیتر دەستی لە بەخیلی هەڵگرتووەو دڵسۆزانە ئەرکی سەرشانی جێ‌بەجێ کردووە .

هەمان‌کات کە دانتێ پاپاو قەشە خراپەکان بێ‌بەزەییانە بە ئاگری دۆزەخ دەسووتێنێ شاعیرو نووسەرە بتپەرستە گەورەکان بەرز دەنرخێنێ‌و بە چاوی ڕێزو خۆشەویستی‌یەوە سەیریان‌دەکا ، ئەوانیشی لە ئەعراف لەنزیك بەهەشتەوە داناوە، لەگەڵیان دەدوێ، یادی خزمەت‌و چاکەکانیان دەکاتەوە. لەوەیش زیاتر ، ڤێرجیلی ناوداری کردۆتە ڕێنومای خۆی ، بە جووتە پێکەوە ئەعراف دەبڕن . ڤێرجێلی شاعیری بتپەرستی ڕۆمانی کە ساڵی حەفتای پێش زایین لەدایك‌بووەو ساڵی نۆزدەی پێش زایین کۆچی دوایی کردووە پیاوێکی زاناو داناو هەست ناسك‌و شەرمن ، نمونەی ڕەوشت بەرزی‌و دڵسۆزی بووە . لە بەرهەمەکانیدا لە هەر شت زیاتر بایەخی بە مرۆڤ داوە ، باسی جوتیارو شوان‌و کچە لادێی‌و جوانیی سروشتی کردووە . ڤێرجیل نیشتمان‌پەرست بوو ، خۆزگەی بەو ڕۆژانە دەخواست کە ڕۆما تیایاندا بەهێزو یەکگرتوو بوو . ئەوانەش بەس‌بوون بۆئەوەی ڤێرجیل لە زووەوە سەرنجی دانتێ ڕابکێشێ . بەڵام دانتێ لەو هەڵبژاردنەیدا

مەبەستێکی‌تریشی هەبوو . ڤێرجیلیش وەك ڕووناکبیرانی ڕۆژگاری ڕێنیسانس لە قۆناغێکدا دەژیا ڕۆژی نوێ لەوەوە سەری دەرهێنابوو ، ئەویش ، وەك ئەوان ، عەودالی تەوژمی گۆڕران بوو .

لە سی‌یەمین سروودی ئەعرافدا ناوی پاتریس پۆرتیناری دێتە ناو کۆمێدیاوە . لەوەدا دانتێ وردەکاری‌یەکی هونەرمەندانەی کردووە ، چونکە بەوپێیە پاتریس لە ٣٠ سروودی ئەعرافو لە ٣٣ سروودی دۆزەخدا ناوی نی‌یە کە پێکڕا دەکەنە ٦٣ ، کۆی سێ‌و شەشیش دەکاتە نۆ . بە هەمان دەستوور پاتریس لە ٣ سروودی ئەعرافو لە ٣٣ سروودی بەهەشتدا ناوی هەیە کە پێکڕا دەکەنە ٣٦ ، کۆی شەش‌و سێش یان هەر دەکاتە نۆو دانتێش ، وەك باسمان‌کرد ، لە تەمەنی نۆ سالیدا بوو کە پاتریس بۆ یەکەم جار تەلی دلی توند هەژاند .

دوای ئەوەی دانتێ لە دوا قۆناغی ئەعرافدا تووشی یەکەم خۆشەویستی ژیان دەبێ ئیتر ئەو دەکاتە ڕێنومای‌و لەگەلی دەچێتە بەهەشت . هەرچەندە ، بێ‌گومان ، خۆشەویستیی ڕەسەن هاندەری یەکەمی ئەو هەلبژاردنەی پاتریسە ، بەلام هەمان‌کات گومان لەوەش ناکرێ کە دانتێ بەو کارەی دەیویست بەرخی بەرزی مرۆڤی هاوچەرخی خۆی‌و هەستی ڕێزی بەرامبەر

ژنە مرۆکی عیسایی نیشان‌بدا ، چونکە لەڕاستیدا دانتێ بە هیچ جۆر دژی ئایینی عیسایی نەبوو بەلکو دوژمنی باوەکوشتەی ئەوانە بوو کە ڕووی ڕاستەقینەیان شێواندبوو ، ئەوانەی لەژێر پەردەی ئاییندا ئەوی نەدەشیا دەیانکرد .

لە دوا بەشی « کۆمێدیای یەزدانی »دا دانتێ بە شێوازێکی دلڕفێن باسی بەهەشت دەکات . بەهەشتی کۆمێدیا جێگەی حەوای دلسۆزان‌و نیشتمانپەروەران‌و پیاوچاکانە ، جێگەی ئەوانەیە کە لە ژیاندا ئازاری کەسیان نەداوەو لە چاکەو دلسۆزی‌و خزمەت‌و خۆشەویستی بەولاوە شتێکي تریان نەزانیوە .

دانتێ ئەلیجیری نیشتمانپەروەرێکی دلسۆز بوو . ئەو دەیویست ئیتالیا یەکگرتوو ، بەهێزو خاوەن دەسەلات بێ .

هەر کەسێك ڕۆژێك لە ڕۆژان خزمەتێکی ئیتالیای کردبێ ئەوی لە کۆمێدیادا هێناوە . هەر بەوجۆرەش زۆر بەتوندی ڕەخنەی لە باری سیاسیی ئیتالیای سەدەی سیازدەمین گرتووە ، بەجۆرێك دەیویست سەرنجی پێ ڕابکێشێ‌و هەستی پێ ببزوێنێ . ئەوەتا لە سروودی شەشەمینی ئەعرافدا ڤێرجیل‌و سۆردیلۆی شاعیری کۆنی ڕۆما یەکتر دەبینن ، هەر کە ناوی نیشتمان دێ هەردووکیان بەگەرمی باوەش بەیەکدا

دەکەن(٢٦) . کاتێك دانتێ بەوجۆرە دەیانبینێ ماتەمینی دایدەگرێ چونکە پارچە پارچەیی‌و ڕەشبگیریی نیشتمانی بیردەکەوێتەوە کە « بۆتە کەشتی‌یەکی بێ کەشتی‌یەوان لەناو زریانێکی پڕتەوژما » . «یاسا چ دادێك دەدا ئەگەر کەشتی‌یەکە بەدەست سەردارێکی لێهاتووەوە نەبێ ؟ » دوای ئەو پرسیارە دانتێ بە چاوی پڕفرمێسکەوە ڕوودەکاتە قاپیی خواوەندی مەزن ، دەیەوێ بزانێ چاوی ڕەحمەتی لەئاستی نیشتمانی خۆشەویستیدا نوقاندووە یا کاری خێری بەدەستەوەیە بۆی . هەرلەوێدا دانتێ دەکەوێتە لۆمەی فلۆرەنسە کە « عەدالەت تێیدا تەنها لەسەر زارانە » ، کە دانیشتوانی کوژراوی پارەی مفت‌و پایەی بەرزن ... ئەی ئیتالیای خۆشەویست « ڕۆلە زیندووەکانت کە وان لەناو یەك دیوارو یەك سەنگەردا دەست لە کوشتاری یەکتر هەلناگرن ، یەکتر لەت‌و کوت دەکەن» !. ئەی ئیتالیای کلۆل « بڕوانەرە ڕۆخی دەریاکانت‌و ئینجا بڕوانەرە سەر سینەت بزانە لە هیچ قوژبنێکدا ترووسکی ئاشتی بەدی دەکەیت ؟ » .

دانتێ باش لەوە گەیشتبوو کە ڕەوشت بەرزی مەرجێکی بنەڕەتیی سەرکەوتنی کۆمەلە ، لەبەرئەوە عەودالی مرۆڤی نموونە بوو . دەیزانی « هەزار سالی ژیان لەئاستی نەمریدا تروکەیەکە ، ناوداری‌و شۆرەت چەشنی گیا سەوز دەبێ‌و زوو وشك هەلدێ » ( سروودی یازدەمینی ئەعراف ) . بۆ دەربڕینی ئەو مەبەستە بەرزەی دانتێ گەلێك نموونەی جوان‌و ماناداری لە « کۆمێدیای یەزدانی »دا هێناوەتەوە . وەك بەلگە ئەم دوو نموونەیەی سروودی پازدەمینی ئەعراف دێنمەوە :

**لەپڕ ئافرەتێکی‌ترم بەدی‌کرد ، فرمێسکی خەفەت‌و**
**تووڕەیی جۆگەی لەسەر گۆنای بەستبوو .**
**ڕووی دەمی تێ‌کردو وتی :**
**« ئەگەر تۆ سەرداری ئەو شارەی کە خواوەندانی**
**ـ کۆن ـ لەسەری پەلاماری یەکیان دا ، ئەو**
**شارەی تیشکی هەموو زانستێکی لێوە دەدرەوشێتەوە ،**
**ئەوا ، ئەی پستراتۆس ، تۆلە لەو دوو**
**دەستە چەپەلە بسێنە کە بەئاشکرا لە**
**گەردنی کیژۆلەکەمان ئالان» .**
**ئینجا ئەو سەردارە ناسکەم بەدی‌کرد ، بە ڕوویەکی**
**خۆشەوە پێی‌گوت :**
**« جا ئەگەر ئێمە سزای ئەوانە بدەین کە خۆشیان**
**دەوێین ئاخۆ دەبێ چی لەوانە بکەین کە ڕقیان**
**لێمانە؟ » .**

بەوجۆرە دانتێ یەکێك لە داستانە یۆنانی‌یە کۆنەکانمان بۆ دێنێتەوە . گوایە لاوێك لە یەکێك لە شەقامەکانی شاری

ئەسینـادا ئاشکرا پەلامـاری کچی سـەرداری ئـەو شـارە پستراتۆسی[٢٧] داوەو ماچی کردووە . شاژنی دایکی شێتگیر بووەو پستراتۆسی هاوسەری هانداوە تۆڵە لەو لاوە بسێنێ . ئەویش لە وەڵامدا بەهێمنی پێی گوتووە :

**«جا ئەگەر ئێمە سزای ئەوانە بدەین کە خۆشیان دەوێین ئاخۆ دەبێ چی لەوانە بکەین کە ڕقیان لێمانە؟ »** .

نموونەی دووەم :

**ئینجا دەستەیەکم دی خوێن لە چاویان دەباری ،**
**بەردەبارانی لاوێکیان دەکردو بەتووڕەیی هاواریان**
**لێك دەکرد :**
**با بکوژرێ ، با بتۆپێ ...**

**ئەویش لەژێر زەبری مەرگدا بە بەرچاومەوە دەکەوت ، بەڵام تا دواهەناسەی چاوەکانی بڕیبووە ئاسمـان ... لە یەزدانی بەرز دەپاڕایەوە لەوانە خۆش بێ کە بەردەبارانیان دەکرد »** .

بەوجۆرە دانتێ باسی کوشتنی ستیڤانمان بۆ دەکات کـە یەکێك بوو لە سەردارە نـاودارەکانی ئـایینی عیسـایی . ستیڤان کاتی خۆی ڕەخنـەی لە چەند لایـەنێکی ئـایینی مووسایی گرتووەو گوایـە دەستـەیەك جوو لەسـەر ئـەوە بەردەبارانیان کردووەو ئەویش لە خـودا پاڕاوەتەوە لێیـان نەگرێ و بیانبەخشێ .

لەوانەیە لەو بۆچوونانەی دانتێدا زێدەڕۆیی ڕۆمانسی هەبێ . بەڵام گرنگ مەبەستی بەرزی‌یە کە هـەمیشـە چاکە بەلایەوە چاك بووە . سـەرتاپـای ڕەخنەو ستـایشـەکانی لە جێگەی خۆیاندا بوون . دانتێ تەنـانەت ڕەخنـە لە خۆشی دەگرێ . لە یەکەم دیدەنیـدا پـاتریسی خۆشەویستی لێی دەپرسێ ئاخۆ دوای مەرگی ئەو هیچ خۆشی‌یەکی ژیان سەری لێ شێواندووەو ڕێگەی ڕاستی لێ ونکردووە . ئەویش لە وەڵامدا دان بەوەدا دەنێ کە «دوای ونبوونی ئەو» جاروبار پێی هەڵنوتووە ! .

دەریـای بێ‌بنی «کۆمێدیـای یـەزدانی» سـەرەتـایەکی بێ‌کۆتایی‌یـە . ڕشـتـەی مرواری‌یەکانی ڕۆژبەڕۆژ زیـاتر دەدرەوشێنەوە . کۆمێدیا وەستایانە ئابڕووی کۆت و زنجیرە ڕەشەکانی سـەدە ناونجی‌یـەکانی بردو چـرای بۆ ڕزگاری و سـەرفرازی و ژیانی نوێ هەڵکـردو لەوێوە بەرەو پێش بەگوڕ پالی بە ڕەوڕەوەی مێژووەوە نا . وەك گرانتی مێژوونووسی ڕۆژئـاوایی دەڵێ کۆمێدیـا بەڕاستی «ئاوێنـەی سـەرتاپای زانست و هەست و خواستی» چەرخی خۆی بوو[٢٨] . مەبەستی بەرودوای کۆمێدیا مرۆڤ و نیشتمـانە . لـەبەر ئەوانەشـە

«کۆمێدیای یەزدانی» بۆتە بەرهـەمێکی نەمرو جێگەی ڕەوای بۆ خۆی لە قووڵایی دەروونی نیشتمانپەروەران و دڵسۆزان و زانایـان و هونـەرمەنـدان و ڕەمـەکی ڕوونـاکبیرانی وڵاتـە پێشکەوتووەکاندا کردۆتەوە . سەدان ساڵە بۆتە یەکێك لـە هاندەرە گـەورەکانی شۆڕشگێڕانی ئیتالیـا . هونەرمەندێکی لێهاتووی وەك فرانسوا ڕۆدان (١٨٤٠–١٩١٧) دوا ٣٧ ساڵی ژیـانی بۆ دروستکـردنی پـەیکـەری «دەروازەی دۆزەخ» تەرخانکرد کە وێنەکانی لە کۆمێدیاوە وەرگرت و ئینجا فریاش نەکەوت تەواوی بکات . هاوڕێ و شـاگردەکانی بۆیان تـەواو کردو ئێستە موزەخـانەی ڕۆدانی لە پـاریس ڕازاندۆتەوە . تەنانەت هیتلەریش شـــانازیی بە دانتێ و بەرهەمەکانی‌یـەوە دەکردو دەیویـست بیانکاتە بەڵگەی سەلمێنەری بەرزیی ڕەگەزی ئاری .

شایانی باسیشە دانتێ بۆخۆی ئەو بەرهەمەی ناونابوو «کۆمێدیـا» ؛ بەڵام نووسـەرانی دوای خۆی وەك نیشـانەی جوانی و تەواوی وشـەی یەزدانی‌یان پێوە لکاند .

لە ڕۆژگاری دانتێوە ڕووناکبیران ڕوویان کردە کۆمێدیاو کەوتنە ڕوونووس کردن و بڵاوکردنـەوەی . زۆری نەخـایاند کاتێك ڕووناکبیرانی دەرەوەی ئیتالیاش قۆستیانەوەو دەستیان دایە وەرگێڕانی . هەمانکات «کۆمێدیای یەزدانی» یەکێکە لەو بەرهەمە ئەدەبی‌یانەی چاپخانەکان لەگەڵ داهاتنی چاپی نوێدا کەوتنە چاپکردنی . سـاڵی ١٤٧٢ . واتە پاش ماوەیەکی زۆر کـەم لە دۆزینەوەی چـاپی نوێ لەلایـەن گۆتێنبورگەوە . کۆمێدیا بۆ یەکەمجار لە مێژوودا چاپکرا .

بێگومان ئەوانەی باسمانکردن واناگەیێنن «کۆمێدیای یەزدانی» یا بەرهەمەکانی‌تری دانتێ هیچ کەموکورتی‌یان نی‌یە . زۆر مەبەست و ئامانج هەن دانتێ تەواو نەیپێکاون . بەوێنە بەلای ئەوەوە زانسـت و بەرزکردنەوەی ئاستی بیر تاکە ڕێگەن بۆ جێ بەجێ‌کردنی بەختـەوەری و سـەرفرازی بۆ مرۆڤ . ئیمپراتـۆریی ڕۆمـانی کـە لە پەلوپۆ کـەوتبوو لای دانتێ «گەورەترین هیوای جیهانی عیسایی بوو » .

دیارە ئەوجـۆرە کورتبینی‌یە ئاسـایی‌یانە بۆ ڕۆژگاری خۆیـان نـاتوانن هیچ لـە پایـەی یەکجـار بڵنـدی دانتێ و بەرهەمەکانی کەمبکەنەوە . بەتـایبەت ئەگەر ئەوەیش لەبیـاد نەکـەین کە نـە ئەوو نە کـەسی‌تـری وەك ئەو ئـەوسـاکە نەیاندەتـوانی خۆیـان‌بە تەواوەتی لـە دوا تاڵەکـانی سـەدە ناونجی‌یەکان ڕزگار بکەن . وەك ئێنگلس دەڵێ پێویستە ئەوەمان لەبیربێ کە دانتێ وەك چۆن یەکەم شاعیری چەرخی نوێ بوو هەمـانکاتیش دوا شـاعیری سـەدە نـاونجی‌یـەکان بوو .

مێژوونووسیش هەن پێشنیار دەکەن «کۆمێدیای یەزدانی» بکرێتە هێڵی نێوان ئەو دوو چەرخەی مێژوو[٢٩].

هەرچۆن بێت نەمریی دانتێ لەوەدوە هاتووە کە ورد لە هەرکەکانی قۆناغ تێگەیشتو دڵسۆزانە ڕەفتاری لەگەڵ کردن و جۆردی ڕەوانی بۆ دۆزینەوە . لەوەدوە هاتووە کە دەیزانی :

**« هەزار ساڵی ژیان لە ئاستی نەمریدا تروو‌کەیەکە»**

**ــ ماویەتی ــ**

**پەراوێزەکان :**

---

**(١) زیاتر مەبەستمان ئەورووپای ڕۆژئاوایە .**

**(٢) لەبەر چەند هۆیەك كە ئێرە جێگەی باسیان نی‌یە ئیمپراتۆریی ڕۆمانی کۆن ساڵی ٣٩٥ بووە دوو بەشەوە یەکەمیان هەر بەوناوەوە مایەوەو بەشی ڕۆژئاوای ئەو وڵاتە کۆنەی گرتەوەو ئەوی‌تریشیان بە ناوی ئیمپراتۆریی بیزەنتی‌یەوە بەشی ڕۆژهەلاتی گرتەوە .**

(3) J.R. Strayer, H.W. Gatzke, E.H. Harbison, The Mainstream of Civilization, the second ed., New York, 1974, p. 375.

**(٤) بروانە:**

C.L. Becker and K.S. Cooper, Europe since 1600, New Jersey 1964, p. 28.

(5) D. Hay, Europe in the fourteenth and fifteenth centuries, London, 1966, p. 59.

(6) Ibid, pp. 131-132; C. Hayes, Modern Europe to 1870 New York, 1959, p. 135.

(7) E.S. Crosby, Reformation and the Reformers Amsterdam, 1963, p. 95.

(8) Ibid, p. 57; H.J. Grimm, The Reformation Era 1500-1650, fourth printing, New York, 1958, pp. 49-51.

**(٩) بروانە : ر. موسجروف سكوب ، تراث النهضة ، ــ « تأريخ العالم » ، المجلد السادس ، ص ٤٣ .**

**(١٠) ئەعراف یا «مطهر» بەوشوێنە دەگوترێ کە گوایە کەوتۆتە نێوانی دۆزەخ و بەهەشتەوە . وشەی «الاعـراف» لە قورئانی‌پیرۆزدا هاتووە .**

**(١١) بروانە : الدكتور عبدالقادر احمد اليوسف ، العصور الوسطى الاوروپية ، صيدا ــ بيروت ، ١٩٦٨ ، ص ٢٤٨ ــ ٢٤٩ .**

**(١٢) «محاكم التفتيش».**

(13) E.S. Crosby, Op. Cit., p. 240.

(14) Ibid, p. 239.

**(١٥) هیچ سەرچاوەیەك ژمارەی قوربانی‌یەکانی ئەو شۆڕشەی بە لە ٥٠ هەزار کەمتر لە قەڵەم نەداوە بەوێنە بروانە :**

(C. Hayes Op. Cit., p. 143)

**(١٦) دانتێ مانگی مایسی ساڵی ١٢٦٥ لەدایك‌بووە ، بەڵام تائێستە ئەو ڕۆژەی تێیدا هاتۆتە دونیاوە بەتەواوەتی نەزانراوە .**

**(١٧) مێژوونووسان نازناوی «پایتەختی ڕینیسانس»یان داوەتە فلۆرەنسە .**

**(١٨) ئەوساکە ئیتالیا بەسەر ژمارەیەك میرنشینی سەربەخۆدا دابەش بووبوو .**

(19) H.B. Cotterill, Medieval Italy, New York, 1915, pp. 51-544.

**(٢٠) زۆر خۆراك هەن کە تەنها لە ئاردی گەنم دروست دەکرێن و ئەوسا لە خواپێداوەکان بەولاوە کەسێکی‌تر دەستیان پییاندا ڕانەدەگەیشت . وێڕای ئەوە نانی جۆ بۆ مەعیدە سووکترە وەك لە نانی گەنم ، واتە هەزمی زمانی نەتەوەیی وەك نانی جۆ لە هەزمی نانی گەنم وەك زمانی لاتینی ئاسانترە .**

**(٢١) ا.ا. جوبێر ، دانتێ ، بە زمانی ڕووسی ، ــ «مێژووی جیهان» ، بەرگی سێیەم ، مۆسکۆ ، ١٩٥٧ ، ل ٦٢١ .**

**(٢٢) «خوێندنەوەی بەرهەمەکانی دانتێ» ، دانانی دەستەیەك زانا ، بە زمانی ڕووسی ، مۆسکۆ ، ١٩٧١ ، ل ٥٩ .**

**(٢٤) بروانە : دانتى اليجيرى ، الكوميديا الالهية . المطهر ، ترجمة حسن عثمان ، الطبعة الثانية ، القاهرة ، ١٩٧٠، ص ٤٧١ .**

**(٢٥) لە سروودی نۆزدەمینی ئەعرافدا ناوی‌هێناوە .**

**(٢٦) هەردوو شاعیری ڕۆمای کۆن ڤێرجیل و سۆردیلو خەڵکی شاری مانتوا بوون .**

**(٢٧) ئیمپراتور پستراتۆس لە نێوانی ٦٠٥ و ٥٧٢ی پێش زاییندا فەرمانڕەوایی کردووە .**

(28) A.J. Grant, A history of Europe, part II (The Middle Ages), London, 1929, p. 464.

**(٢٩) بەوێنەبروانە:**

H.B. Cotterill, Op. Cit. p. 494.

شوكور مستەفا
بە كرمانجیی سەروو و خواروو
ئامادەی كردووەو
پێشەكیی بۆ نووسیوە

# داستانی كەڕو كولك

**پێشەكی :**

قاچاخێ مراد ، لە سەرەتایێكدا ، كە بۆ « سیابەندو خەجێ » یەكەی سیابەندۆف سەمەندی نووسیوە ، بەراووردكێ یەكی لە نێوان داستانی خەجو سیابەندو « كەڕو كولك » دا كردووە . دەڵێ :

« داستانی « سیابەندو خەجێ » دەستەبرای « كەڕو كولك » ە . هەردوو داستانەكە لە بارەی زۆرداریی خەلیفەكانی سەروەختێ دەدوێن ، كە كوردیان لەو دەمەدا لێ ڕابون و ئاغایەلی یان لێ قوبووڵ نەكردوون . پاڵەوانی هەردوو داستانەكە وەك یەك كەڵەمێردن ، وەك یەك بەجەرگ و ئازان . وەك یەك ڕاستگۆ و سەرڕاستن ، وەك یەك بێ پەرواو چاونەترسن . لە مەیدانی میللەت پەروەریدا قارەمانێتی و ئازایەتی تانجی سەری وانە . بەڵام سیابەندیش و كولكیش هەردووك سەرسەختن . كولك بەگوێی دایكی خۆی ناكا . دەڕواو دێتە كوشتن . سیابەند بە قسەی خەجێ ناكاو كەڵەكێوی ورگی دەدڕێ :

سپانێ خەلاتێ ب تەم و مژە

كێ دیتی یە نێچیر نێچیر ڤانێ بكوژە !

بەرانبەر بە سیابەند حەوت برای خەجێ و میری عەرەبان وەستاوون . هەرچی كولكە شەش خاڵی بەرانبەر وەستاوون . كاتێكی كولك دێتە دیوەخانی میر ، مێرخاسی و كوڕەكوڕدی میر ناتوانن فنجانە قاوە هەڵگرن و بیخۆنەوە . تەنیا هەر دەوێرێ ئەوە بكا . ئەو دەیویست خوشكی خۆی بە میری عەرەبان بدا ، چونكە دەوڵەمەندبوو . بەڵام سیابەندو خەجێ بەرانبەر بەمە شەڕدەكەن . بائەوەیش بەبیر بێنینەوە . كە چییان بە مارەیی و شیربایی لە سیابەندو كولك دەویست . هەردوو پاڵەوان سێوین ڕاستە كولك تەنیا لە بابەوە هەتیوە . بەڵام هەر بە هەتیو دەزاندرێ .

باوكی كولك مردووە ، بەڵام دایكی ساغە . باوی كولك بە ئاشكرا دەزانین كێیە ؟ بەڵام سیابەند بە تاكی تەنیایە . نەدایكی هەیە ، نە باو . ئەو كوڕی سلیڤانەو بەناوی خێڵی سلیڤی یەوە ناسراوە ... » و چەند تێبینی یەكی دی .

جا هەر ئەم قسانەی قاچاخێ مراد بوو ، كە بە پەرۆشەوە لە دەستەبراكەی داستانی سیابەندو خەجێ بگەڕێم . خودا كاری ئەمینی عەڤدال ڕاستكا ، لە كتێبی « خەبەرناما كوردییە ڕاست نڤیساندنێ » یەكەیدا ئەم داستانی « كەڕو كولك »ەی بە نموونە بلاوكردۆتەوە ، خواوڕاستان بەگیرم كەوت ، منیش او بە كرمانجی یەكەی و سۆرانی یەكە پێكەوە بلاوی دەكەمەوەو ئەم چەند تێبینی یەی خۆشمی بەگەڵ دەخەم .

یەكەم : ئەو ڕووداوە لەوە دەچێ كە لە دەوروبەری چۆمی « خابوور » ڕووی دابێ .. ئەو ناوە لەم داستانەدا بە (خاموور) هاتووە .

دووەم : شەڕی خاڵ و خوارزا لە ناو كوردەواریدا وەختێكی تیژدەبێ كە خاڵوان لە تیرەیەكی دی بێ ..

سێیەم : ئامۆژگاری یەكانی دایكی كەڕو كولك ، یەكیان ئەوەیە ، كە كار مامزان ڕاونەكەن . دووەمیان ئەوەیە ، كە نابێ ( سۆسك ) ، كە ناوی ئەسپە ، لە گەڕاو ئاوبدەن ، سێیەمیان ئەوەیە ، كە تا لەسەر بەردەستێ بحەسێنەوەو لەبن دارێكی بهێورێن قاوو پووشووی لێ وەگیركەوێ ؟؟ كارمامزەكە دیارە كارمامزێكی دیاریكراو نیە ، بۆیەش نابێ ڕاوبكرێ ، چونكە بەستەزمانە ، بەڵێ تانهۆیش لە زۆر جێگای كوردستاندا خەڵك زۆری بەزە بە كارمامزان دێتەوەو حەكایەت و چیرۆكیش لەسەر ئەم بەزە بەكارمامزاندا هاتنەوەیە بە كوردی زۆرە ، بەڵام ئەگەر « گۆلەگەنیو » جێگایەكی ، ئاوێكی دیاری كراوبێ ، دیارە ئاوەكەی یا گەڕاوبووە ، یا ناسازبووە بۆیەكا جێی دووبەختی بووە . خۆ ئەگەر هەر گۆلێكی ئاو گەنیوی پیسیشی مەبەستبێ . ئەوە نەسیحەتەكە لە جێی خۆیدایەو بە تاقی كردنەوە ئاوی بۆگەن بۆ خواردنەوە دەستنادا . بەردەستی یەكەو پووشووەكەش لەوە دەچێ یا نەزەرگایەك ، بەردێكی پیرۆزبووبێ ، یا هەر لەبەر ئەوەی كە ئەمانە دوو شتی بەفەڕن ڕێزیان لێگیراوە . جا چ لە نەزەرگاو شەخس و پیرو بەردی پیرۆز زۆرترە لە كوردستان ؟

چوارەم : ئەم بەیتە لە ڕووی هێندێ شتەوە واپێ دەچێ دەماودەم بەر دەسكاری كەوتبێ ، دەنا « گوللە ، دووربین ، قاوە ، تووتن .. » شتی زۆر كۆن نین .

# داستانێ کەڕو کولك
# بەکرمانجیی سەروو

وەختەکێ عێلا عەمەرێ گێسی قەوخەکە گران داتینە .
عێلا عەمەرێ گێسی حەموو تۆپ دبن ،
بۆنا خاستنا پەریشان خاتوونێ .
عەمەرێ گێسی فینجانا قاوێ تژی دکە ، داتینە ، دبێژە :
ــ کێ کو فینجانا قاوێ وەلگەڕینە ،
هەڕە بێجانێ ژعێلا عەمەر ئاغا بینە ،
ئەوێ پەریشانێ حەلالی‌یا خوەدێ بستینە .
عەمەرێ گێسی دبێ :
ــ فێزا ئۆبا تە کۆنێ تەزەهاتی ،
کەڕو کولکێ برا مانە .
عەمەرێ گێسی خولامەکی دشینە ،
بەی کەڕو کولکێ برا ، تینە .
کولك تێ چەعف ل قەوخێ دکەڤە ،
دبێ ، ــ ئەڤ چ بەعسە ، چ گلی‌یە ؟
کەڕ دبێ ، ــ کولکێ ، برا !
ئەڤا دەعوا پەریشان خانمێ‌یە ،
کی فینجانا قاوێ وەرگەڕینە ،
هەڕە ، بێجانێ ژ عێلا عەمەر ئاغا بینە ،
ئەوێ پەریشانێ حەلالی‌یا خوەدێ بستینە .
کولك تاپ نادە ، فینجانێ وەلدگەڕینە ،
عەمەرێ گێسی گهیشتێ ، فینجانێ دێست بگرە ،
وەکی وەلنەگەڕینە ،
کولك فینجان وەلدگڕینە ،
خوونا رەش ژ بەر تلی‌یێ عەمەرێ گێسی دەرتینە
کولك گۆ ، ــ ئەرێ ، کەڕێ برا ،
بکە و بلەزینە ،
خوە یالێ کۆنڕا بگهینە ،
تاخما زێڕین مال دەرینە ،
پاشێ خوە یالێ تەولەخانێڕا بگهینە ،
سۆسکێ ژ هوندووڕ بکشینە ،
تانگا ل تانگا بشدینە ،
سەگلاوین سیاربە ،
خوە عێلا ژێڕینڕا بگهینە ،
هەر چار سیارێ قەوخێ منڕا بینە .

کولك دبێ ــ کەڕۆ ، برا ،
هەرگێ وەردەکا دێ دبێ :
ــ چ بوویە ، چ قەومی‌یە ؟ بێژە :
ــ وەلە ، دایێ ، تشت تونینە .
عێلا عەمەرێ گێسی دەعوەتە ،
کولك دخازە کێفێ دەربازکە .
کەڕێ برا دکەو دلەزینە ،
کی وی ،وی ویك ، وی ، وی ،
خوە ب کۆنڕا دگهینە ،
کی ، وی ، وی ویك ، وی ، وی ،
تاخما زێڕین مال دەرتینە ،
کی ، وی ، وی ویك ، وی ، وی ،
خوە ئالیێ تەولە خانێڕا دگهینە ،
کی ، وی ، وی ویك ، وی ، وی ،
سۆسکێ ژ هوندووڕ دکشینە ،
کی وی ، وی کی ، وی ، وی ،
تەنگا ل تەنگا دشدینە ،
کی وی ، وی کی ، وی ، وی ،
دووڕڕا سەگلاوین دکشینە .
کی وی ، وی کی ، وی ، وی ،
تەنگا لێ دشدینە ،
کی وی ، وی کی ، وی ، وی ،
ڕکێڤەکێ خوە عێلا ژێڕینڕا دگهینە ،
کی وی ، وی کی ، وی ، وی ،
هەر چار سیارێ دەعوێ تینە ،
کی وی ، وی کی ، وی ، وی ،

وەردەکا دێ دبێ :

ــ کەڕۆ ، لاوۆ ، چ بوویە ؟ چ قەومی‌یە ؟

کەڕۆ دبێژە :

ــ دایێ ، عێلا عەلییێ گێسی دەعوەتە .
عەلییێ گێسی دخازە مێرخاس ،
ئو پەلەوانێد خوە بجەڕبینە .
کەڕ ، کولکێ برا هەر چار ،
سیارێ دەعوەتێ ڕێ دکەڤن .
وەردێ دیسا دبێ :
ــ هەرێ ، دبێ ، عەلییێ گێسیۆ ،
تەیێ یەکە نەچێکر ،
تەیێ دوو گورێد دەڤخوون
بەرب خالا ڤەڕێکر ،
وەردێ دیسا دەبێ :

ـ کەڕۆ ، لاوۆ ، ئەززانم ؛
هوونێ هەڕن سەر خالا شێڕ .
بسەکنن ئەز ناڤ ـ نیشانێ خالێ وە وەڕا بێژم ؛
هەر حەفت خالێ وە تراکچینە ؛
هەسپێ بندا بۆزە خالخالینە ؛
سمێ وانە سمکۆدینە ؛
گوهێ وانە گوهقە مچینە ،
شقڤە لوونێ دەستێ وانا یەك حەلەبینە ؛
سەرکێد سێری یەك کۆدینە ؛
سەرکێد وانە یەك هۆقە تووتنا مووشێ هلتینە .
ڕۆژێد ئۆغرمێ گران ، نەیارا .
فۆرما گورێ بەراتێ قولاپ ـ قولاپ سەرملێ هەڤ دردڤینن .
کولك دبێ :
ـ ودردێ ، بەسەوەرە من تەعنانە .
ئەزێ بکم ، ودکی حەفت برا براك ، تەڕا سلاڤێ نەشینە .
وەردا دێ دبێ :
ـ کەڕۆ ، لاوۆ ، سێ قرار هەنە .
ئەزێ تەڕا بێژم .
دبێ :
ـ گەرەك تۆ بیرنەکی
وێ یەکێ ، مقات ـ مقاتی .
سۆسکێ ئاڤێد گۆلە گەنیابە .
سۆسك ئاڤێد گۆلە گەنیا نەخوە .
یادوودا ، کارێ تەڕێ نەکەنیە .
نێچیرا کارێد خەزالا بێوانە .
توجار دانەینی قڕاجی دارانە .
قڕاجی دارا ژی بێوانە .
هەڕن خوەدێ ئۆغرا وەڕابە .
ئەوانا چوون ئیدی .
وەردا دێ پەی وانڕا کاغەزەکی خالاڕا دشینە .
دنڤیسە ، ـ گەلی برا !
ـ خارزی وە دکەڤە فەرسەنگاوە .
خارزێ خوە بێ قەدر ڤەڕێ نەکن .
ددە مەریکی ، بەرب خاك دشینە کاغەز .
کولك ئەپێجە ڕێ دچە ، دینا خوە ددێ .
دبە چرپینا کارەکە خەزالا ؛
بەر پیێ سۆسکێ بانز ددە .
کولك نەمەردیێ ناکە .
ددە سەر کارا خەزالا .
دگرە تینە .
کەڕێ برا دبێ .
ـ کولك ، برا !

نە تەمیا وەردەکا دێیـە .
نێچیرا کارێ خەزالا بێوانە .
کولك دبێ :
ـ کەڕۆ ، برا !
وەردەکا دێ هاژ چ هەیە ؟
کارا خەزالە مەڕا هم شیڤە ، هم تەعشتێیە .
پەی وێڕا قڕاجی دارا ؛
کەڤری چەقماقا دهێورن .
کولك دبێ :
ـ کەڕۆ ، تو مێرخاساڤا ڕازێ .
ئەزێ قەردولبم .
دسەکنە سڤەترێ .
کەڕ دبێ :
ـ کولکێ برا !
ئیژا تو ڕازێ ؛
ئەزێ قەردولبم .
کولك ڕادزێ .
شەڤ دبە نیڤێ شەڤێ ؛
کەڕ ڕادبە ، سەگلاوین دکشینە ؛
بەرب عێلا عەمەر ئاغا دلەزینە .
تو تشتی وێ ڕاستێ نابینە .
کەڕ ژی گورم کە ددڤێد گوری ل هەڤ تۆپ دکە .
چاوا تالان ، خودڕا تینە .
حەتا کەڕتێ .
سۆسك سەر ئاڤا گۆلە گەنیا ؛
قوشو بەندێ خوە دقەتینە .
کەڕ دینا خوە ددێ ؛
سۆسك تەولەخانێدا تونەنە .
ڤی ئالی ، وی ئالی دلەزینە .
گۆلەك همبەری کۆن بوویە .
خوە سەر گۆلێڕا دگهینە .
دینا خوە ددێ ؛
سۆسکێ ئاڤێد گۆلەگەنیا ڤەخاریە ؛ وەرمییە ؛
قوشو تەنگێ خوە قەتاندییە .
تەنگو قوشێ سۆسکێ لە هەڤ تینە .
گەمێ ل دەڤێ سۆسکێ دخەرینە .
مەیدانەك ، دودا : سۆسکێ دێشینە ؛
تینە ، سۆسکێ تەولێدا گرێ ددینە .
سبە سافی دبە ؛
کولك ڕادبە .
دینا خوە ددێ ؛
کەڕێ برا گورمکە دەڤە ئانییە ؛

دبێ :
کەرۆ ، برا ، ئەڤ چیە ؟
دبێ :
ــ کولك . برا . ئیشەڤ من لێخستیە .
تالان ئانییە .
کولك هاژ سۆسکێ و ئاڤێد گۆلە گەنییا تونەنە .
رۆ ل قامێ نیڤرۆیە .
کولك سۆسکێ تەولێ دکشینە ،
بەرب عێلا عەمەر ئاغا دلەزینە ؛
قەلەچیا سەر فێزا کۆنا خوەد حەملینە ؛
شەڤ داژۆ بەر دەرێ کۆنی رەشی عەرەبینە ،
دچە هوندورێ کۆن .
دینە خۆە ددێ ،
عەلی عەمەر ئاغا خەوا شیریندا
هاژ باێی دنێ تونینە .
شەمدانێ دۆرا پەڤ دگوهێرینە ؛
باترۆنەکێ لەسەر کەڤچکا دلێ وی داتینە :
تاغما زێرین هەلدده . مال دەرتینە .
کەر دبێ :
ــ گەلی مێرخاسا ،
عەلا بەرژێر بنهێرن .
ئاگر کەتیە کۆنێ عەلی
عەمەر ئاغا دشەو تینە .
کەر دبێ :
ــ گەلی مێرخاسا
رابن مەجالی ببینن ؛
ئەم برەڤن ، تابا مە تونینە .
ئەڤانا تڤدارەکێ رەفێ دبینن .
کولك خوە ب وانرا دگهینە ،
ئاخما زێرین ئۆرتا مێرخاسا داتینە ؛
دبێ :
ئەڤا پێشرەڤێ یا بلیجانێیە . من ئانییە ؛
وی چاخی ژی عێلا عەمەر ئاغادا
ئەو حەفت رۆ بوو دەعوەت دکرن .
حەفت رۆژ بوو ، ودکی بێجان ئاڤ نەدابوون ؛
بێ ئاڤ مابوو .
خولام بێجانێ تینە ئاڤێ :
سەر چەمێ خامورێ ،
هەما وی چاخی کولك پێرا دەرتێ .
کولك خوە خام دەرتینە ،
عەسێڤا رێ نابینە ،
خولام دبێ :
ــ ئۆلۆ سپارۆ !
تو دینی ، یان ئەفسەنەیی ؟
تە خوە شاش کرییە .
رێیا بوهورێ نابینی ؟
کولك ژ خولێم هیڤی کرییە .
خولام بوهورێ نیشان کرییە .
کولك دەربازی وی بەری ئاڤێ دبە .
کولك خوە کەری داتینە ؛
ب تلیا خولێم ددەعفینە ،
گازی دکە ، بەرب خوەتینە ؛
تەپەکێ ناڤاچەعڤا دخینە ؛
بلیجانێ ژێ دستینە .
کولك دبێ :
ــخولام ، هەرە ، بێژە عەمەر ئاغا .
بێ .ــ کولك بلیجان بر .
حەفت رۆژا وێ قراجی دارا
کەڤرێ چەقماقا بسەکنە ،
هیڤیا تەبە ،
برا پاشێ نەبێژە ؛
« کولك بلیجان شەڤێ دزی ، بر » .
کولك بلیجانێ تینە .
خولام دچە جەم عەمەر ئاغا
گاڤا خولام عەمەر ئاغارا ڤی گلی دبێژە ،
« عەمەر ئاغا هم کەرە . هم گێژە »
هەما وی چاخی کاغەزا کو
وەردەکێ شاندبوو حەفت براراتێ دگهیژە برا .
عەمەر ئاغا عێلا خوە دچڤینە ،
گازی هەر حەفت برێ وەردەکێ دکە ، تینە .
هەر حەفت برا تراکچینە ؛
هەسپێد وانە بۆزە خالخالینە ؛
ناڤکێلێ وانا ناڤتەعژینە ؛
سمێد وانا سمکۆدینە ؛
گوهێ وانا گوهڤەمچینە ؛
شڤقە لنێد دەستێد وانا
یەك هەلە بینە ؛
سەرکێ سێری یەك کۆدینە ؛
سەرکێد وانا یەك هۆقە تووتنا مووشێ هلتینە ؛
رۆژێد ئۆغرمێد گران ، نەیارا ،
فۆرما گورێد بەراتێ قولاپ ــ قولاپ
سەرملێ هەڤ درەڤینن .
کولك دبێ :
ــ وەردەکێ ، بەسە وەرە من تەعنانە ،

ئەزێ بکم ، وەکی ژ حەڤت برا ، براك تەڕا
سەلامێ نەشینە .
برێ مەزن کاغەزێ وەردەکێ دستینە ؛
گلیيا تەمام دفەعمینە ؛
ئەو جەردێ و شەش برا دخاپینە ؛
ئالیکی دنێدا دشینە ؛
خوە ــ خوە بەرب کولکێ خارزیيا دچە ،
وەکی کولکێ خارزیيا دلەکی شابێ
بەرب عێلا عەلیێ گێسیپا بشینە .
برێ مەزن دچە جەم کولك ،
دبێ :
ــ خارزیيا ، هەرە ، تەڕا ئۆغربە ،
منێ جەرد خاپاندیيە ،
ئالیکی دنێدا شاندیيە .
وەکی تو بلێجانێ ببی ،
دەرخی سەرفنیازی .
کولك دبێ :
ــ خالۆ ئەز نەمێرێ شەڤدزیيامە ،
وەکی ئەز بێشەرو دەعو بلێجانی ببم ،
پاشێ جابێ هەرە عەلیيێ گێسیڕا ،
وێ بێژە :
ــ کولك شەڤدزی بلێجانی ئانی .
خال دکەو ناکە ، تو بەند کولك ناخینە .
کولك دبێ :
ــ خالۆا ، کارێ خوە بکە ،
ئەمێ شەڕ بکن .
گلی دەڤێ کولك و خالێدا
هەر شەش برا وێدا تێنە ،
کولك برا تراکچیيە ،
کیوی ، ویك ، وی ، وی ،
پشت ژخالێ مەزن دستینە ؛
خالێ مەزن ناڤا زینا دفڕینە ؛
کیوی ، وی ویك ، وی ، وی .
هەر شەش برێ دن خوە کولكڕا دگهینن ؛
کیوی ، وی ویك ، وی وی .
کولکێ ترادکە ، دلەزینە ،
کیوی ، وی ویك ، وی وی ؛
وەکی پشتێ ژ هەر شەش خالا بستینە ،
کیوی ، وی ویك ، وی وی ،
سۆسك ئەرقەکە حەڕی وێ ناڤێ حازر دبینە ،
کیوی ،وی ویك ، وی وی ؛

سۆسك ئەرقا حەڕیێ خلاس ناکە ، تێدا دمینە ،
کیوی ، وی ویك ، وی وی ؛
هەر شەش برا تراکچینە ،
کیوی ، وی ویك ، وی وی ؛
هەر یەك زەرگەکێ کولك دخینە ،
کیوی ، وی ویك ، وی وی ؛
کەڕێ برا دکە ، دجرینە ،
کیوی ، وی ویك ، وی وی ،
پشتێ ژ هەر شەش خالا دستینە ،
کیوی ، وی ویك ، وی وی ؛
دوو خالا ناڤـا زینا دفڕینە ،
کیوی ، وی ویك ، وی وی ؛
لکولێ مرتب دکە ، دجرینە ،
کیوی ، وی ویك ، وی وی ؛
پشتی ژ خالێ کەڕ و کولك دستینە ،
کیوی ، وی ویك ، وی وی ،
خالەکی وانا ژ ناڤا زینا دفڕینە .
کیوی ، وی ویك ، وی ، وی ؛
بغدۆ دکە ، دلەزینە ،
کیوی ، وی ویك ، وی ، وی ؛
پشتێ ژ خالێ کەڕو کولك دستینە ،
کیوی ، وی ویك وی ، وی ؛
ئەو ژی خالەکی ناڤا زینا دفڕینە .
کیوی ، وی ویك ، وی ، وی ؛
مێرخاس سـیا دکە ، دجرینە
کیوی ، وی ویك ، وی ، وی ؛
ئەوژی خالەکی ناڤا زینا دفڕینە ،
کیوی ، وی ویك ، وی ، وی ؛
سرێ تێ سەر مێرخاسێ چارانە ،
کیوی ، وی ویك ، وی ، وی ؛
مێرخاس چارا ژی دکە ، دلەزینە،
کیوی ، وی ویك ، وی ، وی ؛
خالێ کەڕ کولك (؟)
دۆرا کولك دزڤڕینە ،
کیوی ، وی ویك ، وی ، وی ؛
کولك دکەگازی ، دبێ :
ــ کەرۆ ، برا ، بەسە ،
کۆکا خالا مەقەلینە (مەقەلینە) ،
ئەوی خالی مەکوژە ،
برا دلێ وەردا دێ ژ مە نەمینە .
کەڕ دگرە ، ئەوی خالی تینە ،

درانێ وی دکشینه ،
عەنیێدا دکوته ،
بەرب عەمەر ئاغا دشینه ،
کەرِ تێ جەم کولك ، دبێ :
ـ کولك ، من نەدیت تو مێرخاسی ژ ته چێبوو ؟
سبێ وەردەکا دێ وێ بێژە،
کەری رِەڤەك بوو ،
مێرخاسی یا کولك بوو .
کولك دبێ :
ـ کەرِۆ برا ، سۆسکێ بەر منرِا

ببە ، بینە ؛

ساپۆکێ ژ لنگێ برێ خوە بکشینە ؛
تێ وی چاحی مێرانییا برێ خوە ببینە .
کەرِ سۆسکێ بەر کولکرِا دەبە ، تینە ،
کولك شوور دکشینە ،
هەر چار لنگێ سۆسکێ دفرِینە ،
کولك دبێ :
ـ کەرِۆ برا ، سۆسکێ سەرێ رِیپا نەهێلە ،
برا قیزو بووکێ عێلا عەمەر ئاغا نەئێن
سەر لەشێ سۆسکێ .
نە بێژن :
ـ تو چسبوویی ، وەکی سپارێ سەر تە ژی
مێرخاس بە ؟
کەرِۆ دبێ :
ـ ئەرێ ، کولك ، برا ،
چما تە سۆسك نەکوشتا ،
سۆسك ژمنرِا ناڤدەنگێ من بلند بکرا .
کولك دبێ :
ـ کەرِۆ ، بەسە بکە ڤان خەبەرا ،
وەرە ئەزێ تەرِا بێژم دەردو کولا ،
تو تابووتەکێ برێ خوەرِا چێکە ،
جنیازێ برێ خوە بدە سەر سەرباری
دەڤا پێشن .
دزگینا بلیجانێ باڤێژە زەندا برێ خوەیە .
مەلەکی برێ خوە دەرخە دەرڤا ،
گاڤا ملێ من هەرِە بێ ،
وەردەکا دێ وێ بێژە ؛
« دیاها دچە ، ها تێیە »
وی چاخی گونێ تە تێ تونینە .
بێژە وەردەکا دێ پرسا رِاستیێیە .
پەی وێ یەکێ کولك قوربانا تە بوو .

کەرِی برا ب هەرچار مێرخاساڤا ،
تابووتەکێ کولکرِا چێکن ،
کولك دکن تابووتێ ،
ملێ وی تابووتێرِا دەردخن ،
دزگینا بلیجانێ داڤن زەندێ ،
کاڤوانێ وانا رِێ دکەڤە ،
وەختەکێ ئەو دگهیژن کەوشەنێ عەلیێ
گێسی ،
جاب دچە عەلیێ گێسیرِا ،
دبێ :
ـ عەلیێ گێسی ،
کولکێ برا بلیجان دلەکی شایی ئانی .
وەردا دێ دوورەبینێ داتینە ،
بەر چەعڤێ خوە دگەرِینە ،
کاڤرانێ مێرخاسا دبینە .
مەعتەلمایی دمینە ،
جارا دوودا دوورەبینێ داتینە ،
کاڤرین دبینە .
حەموو تشتی دفەعمینە ،
وەردا دێ دبێ :
ـ هەرێ ، عەلیێ گێسیۆ ،
برا کونێ تە ژ ناڤ کونا دەرێ ،
کورِێ تە بەر دلێ تە هلێ ،

من زانبوو ، کولك هەرِە عێلا عەمەر ئاغا

سلامەت نایێ .

وی چاخی عەلیێ گێسی ، وەردا دێ و پەریشان خانم ، دچن
پێشییا کاڤران .
وەردێ ب کلاما کەررِا تێیە شەرِ ؛ دبێ :
ـ هەرێ ، عەلیێ گێسیۆ !
تە مالخراب بوویۆ ،
من تەرِا نەدگۆ
رِۆژێد ئۆغرمێ گران و نەیارا
کەرِی رِەڤەکە ،
کولکێ پشتڤالێ بمینە ،
کەرِێ برِەڤە .
کەرِ دبێ :
ـ هەرێ ، وەردەکا دێ ،
بەسە ، وەرە من تەعنانە
کەرِ نەمێرێ رِەڤێیە .
وەردەکا دێ دیسا دبێ :

— عەلیێ گێسیێ ، تو چدبێژی ؟
تو ب گوللەکێ من دکوژی ،
چما بەهەڤدا پۆژی ؟
کولك چوویە ، کەرِ بلیجان تەڕا ئانییە .
کەرِ دبێ :
— وەردەکا دێ ،
بەسە وەرە من تەعنانە ،

هەرگێ تو پرسا ڕاستیێ من دپرسی ،

منێ تە قەلاندیێیە کۆکا برانە .
گاڤا گەر ڤێ پرسێ بیر تینە ،
وەردەکا دێ حەموو تشتی دفەعمینە ،
ئیدی زانە کۆکا مالا باڤێ وێ هاتییە ،
پەریشان خانم دبێ :
— وەردەکێ ، بەسە بکن گری‌و شینە ،
هەرگێ کولك چوویە ،
براکەری برا دەوسێ خوەش بمینە .
وی چاخی کەرِ بلیجانێ دبە عەلیێ گێسیرا ،
پەریشان خانمێ ژێ دستینە ،
حەڤت رۆژ ، حەڤت شەڤا ،
دەف — دمعوەتێ خوە دکن ،
ئیدی ئەوە !
ئەو چوونخوەڕا
ئەم ژی مان خوەڕا(١) .

---

١ — گۆت عەڤدۆیێ شەوۆ ، بیست‌و دوو سالی ، ژ ناحییا ئاپارانێ ، گوندێ پامپێ . نڤیسی حاجی جندی ، بنهێرا « فۆلکلۆرا کورمانجا » یەرێڤان ، سالا ١٩٣٦ ، روپێل ١٧٧ — ١٨٨ .

## داستانی کەرِو کولك بەکرمانجی خواروو ..

سەردەمێ هۆزی عەمەرێ گێسی شەرِو هەرایەکی گەورە دەنێتەوە .

هۆزی عەمەری گێسی سەرلەبەر خڕدەبنەوە ،
بۆ داخوازیی پەرێشان خاتوونی .

عەمەرێ گێسی فنجانێ قاوە پردەکا ، دەڵێ :
— هەر کەسێ فنجانی قاوە وەرگەرِێنێ ،

بچێ بێجانێ لە هۆزی عەمەر ئاغای بێنێ ،
خاتوو پەرێشانی بە حەڵالیی خودای ل بۆ خۆ بستێنێ .
عەمەرێ گێسی دەڵێ :

**— کەس نەما لە نێو هۆزی ؟**
**خوڵامەکەی دەڵێ :**

**— لە سەرووی هەوارێ ، لەو ڕەشماڵەی تازە هاتووە کەرو کولکی برا ماوون.**

عەمەرێ گێسی خوڵامێکی دەنێرێ ،
لە دووی کەرِو کولکی برا ، دەیانهێنێ
کولك دێ شەرِو هەرای دەبینێ ،
دەڵێ ، — ئەوە چباسە ، چ قسەو هەرایە ؟
کەرِ دەڵێ — کولك ، برا !
ئەوە هەرای خاتو پەرێشانە .
هەر کەسێکی فنجانی قاوەی وەرگەرِێنێ ،
بچێ ، بێجانی لە هۆزی عەمەر ئاغا بێنێ ،
خاتو پەریشانی بە حەڵالیی خودای لەبۆ خۆبستێنێ .
کولك خۆی ناگرێ، فنجانی قاوە وەردەگەرِێنێ ،
عەمەرێ گێسی گەیشتێ ، فنجانی لە دەست بستێنێ ،
بۆ ئەوەی وەری‌نەگەرِێنێ ،
کولك فنجان وەردەگەرِێنێ ،
خوێنی ڕەش لە پەنجەی عەمەرێ گێسی دەردێنێ ،
کولك دەڵێ ، — یاڵلا ، کەری برام ،
زووکەو وەخۆکەوە ،
خۆ بگەیێنە کن ڕەشماڵێ ،
تاخمی زێرِین لە ماڵێ دەرێنە ،
پاشان خۆبگەیێنە کن تەویلە خانە ،
سۆسك لەژوورەوە دەرێنە
تەنگ‌و بەرەی لێ‌شەتەك دە ،
سواری ئەسپی سەگلاوی خۆ بە ،
خۆوەگەیێنە هۆزی خوارێ
بچۆ چوار سواری شەرکەرم بۆ بێنە .
کولك دەڵێ : — کەرۆی برام ،
ئەگەر وەردەکی دایك گوتی :

**ـ چبووە ، چقەوماوە ؟ بلێ :**
**ـ وەللا ، دایە ، هیچ نەبووەو هیچ نەقەوماوە .**
**هەراوزەنای هۆزی عەمەرێ گێسی‌یە ،**
**کولك دەیەوێ بچێ لەوێ ڕابوێرێ ،**
کەر وەخۆ دەکەوێ ،گورج و خێرا ،

کی
خۆ دەگەیێنێتە ڕەشمال ،

کی
تاخمی زێڕین لە مالێ دەردێنێ ،

کی
خۆ دەگەیێنێتە کن تەویلەخانە ،

کی
سۆسك لە ژوور دەردێنێ ،

کی
تەنگەو بەزەی لێ شەتەك دەدا ،

کی
ە دوورەوە سەگلاوی خۆی ڕادەکێشێ ،

کی
تەنگەو بەرەی شەتەك دەدا ،

کی
بە سەلەفێکی خۆ دەگەیێنێتە هۆزی خوارێ ،

کی
هەر چوار سواری شەڕکەر دێنێ ،

کی
**وەردەکی دایك دەلێ :**

**ـ کەڕۆ ، لاوۆ ، چبووە ؟ چقەوماوە ؟**

**کەر دەلێ :**
**ـ دایە ، شایی لۆغانی هۆزی عەلی گێسی‌یە(١) ،**
**عەلی گێسی ئازاو کەلەمێردانی دەوێ ،**
**دەیەوێ پالەوانانی خۆیانی لێ تاقی‌کاتەوە**
کەڕو کولك و هەر چوار
سوار بەرێ دەکەون .
وەردەکی دایك دەلێ :
ـ عەلی گێسی !
تۆ کارێکی چاکت نەکرد ،
تۆ دوو گورگی دەم بە خوێنیت ،
بەرەو خالاوان ڕەوانەکرد .

وەردێ دیسان دەلێ :

ـ کەڕۆ ، لاوۆ ، من دەزانم ،

ئێوە دەچنە سەر خالەکانتان بۆ شەڕ ،
ڕاوەستن ، با ناوونیشانی خالوانتان بۆ هەلدەم ،
هەر حەوت خالوانتان دلێرن ،
هەسپی ژێریان بۆزی خالخالین ،
تەنگەیان وەکی تەنگەی تاژی ژاروبلاریك .
سمیان خشت و سمقۆتین(٢) ،
گوێیان وەك گوێی قەمچی قوت و قیتن ،
کلکە قەلوونەکانیان هێندەی گەزی حەلەبی‌یان درێژن .
سەرکیان زۆر زەلامن ،
هەر یەك ئۆقە تووتنێکی مووشێ دەگرن .
لە ڕۆژی تووش و دژواردا ،

وەك گورگ لوو دەبنە دژمن ، تێیان ڕۆدێن .
کولك دەلێ :

وەردێ ، بەسە ، بە تانەو توانجم تێ گرە ،
دەبێ کارێکی بکەم لە حەوت برایان ،
برایەکت سلاوی سلاو ئاسایت بۆ نەنێرێ .
**وەردێ دەلێ :**

**ـ کەڕۆ ، لاوۆ ، سێ مەرجم هەن ،**
**پێتیان بلێم .**

**دەلێ :**

**ـ نابێ لە بیریان کەن**

**دەبێ زۆر ئاگات لە سۆسك بێ ،**
**نابێ لە ئاوی گۆلەگەنیوێ بخواتەوە ،**
**دووەمیان ، کارماهزێکت تووش دێ ،**
**هەقت بە سەریەوە نەبێ ، بەستەزمانە ،**
**لەبن داری بە پووشوو و قاو ،**
**لە سەر بەردەستێ‌یەش مەحەسێنەوە ،**
**ئەویش گوناح و بێ‌وەیە .**
**دەبڕۆن ئۆغرتان خێربێ .**
لێیاندا ڕۆیشتن ،
وەردێی دایك کاغەزێکی لە دووی وان
بۆ خالوانی نووسین ،

ـ گەلی براینە !

خوارزایەکانتان دەکەونە بەر چەنگتان ،
بەبێ قەدری بە ڕێیان مەکەن ،

کاغەز دەداتە دەست زەلامێکی بۆیان دەنێرێ ،
کولك جوان و زەریف دەڕوا ، تەماشا دەکا .
کارمامزێك لە بەر دەستەو پێی سـوسکی ڕادەپەڕێ ،
هەڵیدەگاتێ ،

دەیگرێ ، دەیهێنێ .
کەڕی برای دەڵی :

ــ کولکی برام !

ئەدی دایکم تەمێی نەکردین ،
ڕاوە کارمامز گوناهە ،
کولك دەڵێ :

ــ کەڕۆی برام !

وەردەکی دایکم ئاگای لە چیە ؟
کارمامز شیوێشەو چاشتێشە
ئەوجا لە پاشان بەردەستێیە .
لەوێ دەحەسێینەوە .
کولك دەڵێ :

ــ کەڕۆ ، تۆ لەگەڵ ئەم مێرخاسانەدا بنوو ،

من ئێشك دەگرم ،
بۆ سبەینێ ،
کەڕ دەڵێ :
ــ کولکی برام !
ئەوجا تۆ بنوو ،
من ئێشك دەگرم ،
کولك دەنوێ ،
شەوگار ڕادەشکێ
کەڕ هەڵدەستێ ، سواری سەگلاوی دەبێ ،
بەرەو هۆزی عەمەر ئاغای تێدەتەقێنێ ،
چی وا لەو دەوروبەرە نابینێ ،
کەڕ ڕەوکە وشترێك کۆدەکاتەوە ،
بە تالان بۆ خۆی دەیهێنێ ،
لە پاشان دێ ،
سۆسك لە سەر ئاوی گۆلەگەنیو
تەنگەو بەندی دەپسێنێ ،
کەڕ دەبینێ ،
سۆسك لە تەویلەخانە نیە ،
بەملاو بەولادا دەکەوێتە هەڵپەو هەڵەداوان ،
تەماشا دەکا سەگێک وا لەوبەر ڕەشماڵە وەرکەتووە .
دەچێتە سەری ،
دەبینێ ،

سۆسك ئاوی گۆلەگەنیوی خواردۆتەوەو ئاوساوە ،
تەنگەو بەندی پساندووە ،
تەنگەو بەندی لێدەکاتەوە ،
لغاوی لە زاری دەردێنێ ،
یەك دوو سەڵەفی تاودەدا ،
دەیهێنێ لە پشتیرێی دەبەستێتەوە ،
کە سبەینێ ڕۆژ هەڵدێ ،
کولك بەخەبەر دێ ،
سەیر دەکا ،
کەڕی برای ڕەوکەیەك وشتری هێناوە .
دەڵێ :

ــ کەڕۆی برام ، ئەوە چیە ؟
دەڵێ :
ــ کولکی برام ، ئەمشەو تالانم هێناوە ،
کولك ئاگای لە سۆسكو گۆلەگەنیوی نیە ،
ڕۆژ دەمەو نیوەڕوانێیە ،
کولك سۆسکی لە پشتیرێ دەردێنێ ،
بەرەو هۆزی عەمەر ئاغای تێدەتەقێنێ .
پاسەوانان لە سەر کۆنو خێوەتی خۆی دادەنێ ،
شەو داژوا دەگاتە بەر سیامالی عارەبان ،
دەچێتە ژوورێ .
دەڕوانێ ،
عەلی عەمەر ئاغا لە خرپەی خەوێدایە ،
ئاگای لە بای دنیایێ نیە ،
گوللەیەك بە سەر سینگیەوە دەنێ ،
تاخمی زێڕین هەڵدەگرێ لە ماڵێی دەردێنێ ،
کەڕ دەڵێ :
ــ مێرخاسینە ،
تەماشای خوارێ کەن ،
ئاگر لە ڕەشماڵی عەلی بەربووە ،
عەمەر ئاغای دەسووتێنێ ،
کەڕ دەڵێ :

ــ گەلی مێرخاسینە ،

هەستن چارێك بکەن ،
با هەڵێین ، خۆمان ناگرین ،
خۆ تەیار دەکەن ، تەدارەکی ڕادانێ دەبینین .
کولکیان ڕادەگاتێ ،
تاخمی زێڕین لە ناوەندی مێرخاسانی دادەنێ ،
دەڵێ :

**ــ ئەوە پێشەکیی بلیجانە ، من هێناومە ،**

**هەنگینێ هۆزی عەمەر ئاغای ،**
**حەوت ڕۆژ بوو شایی‌یان دەگێڕا ،**
**حەوت ڕۆژ بوو بێجانیان ئاو نەدابوو(٢) تێنی‌بوو ،**
**خولام بێجانی دەباتە سەر چۆمی خامووری ،**
**ئاوی دەدا .**

کولك چاوی خەوالوو دەبێ ،
چاوی نابینێ ، چاك ڕێ دەرناکا ،
خولام دەلێ :

ــ کوره سوار !

ئەتو شێتی ، یا ئەفسوونیان لێ‌کردووی ؟
یا نەخۆ لە هۆزی مە نی ؟
ئەتو لێت شێواوه ،
ڕێ‌بەدیێ ناکەی ؟
کولك تکای لە خولام کردووه ،
خولام ڕێبازی نیشان‌داوه ،
کولك دەپەڕێتەوە ئەوبەری ئاوێ ،
کولك گازی خولام دەکا ،
بە ئیشارەتی پەنجە ،
بۆ کن خۆی گازی دەکا ،
بێجانی لێ‌دەستێنێ .
دەلێ :

ــ خولام ، هەڕۆ بێژە عەمەر ئاغای ،

بێ . ــ بلێ ، کولك بلیجانی فڕاند ،
حەوت ڕۆژان لە کن چیای بەردەستێ
چلوەنۆڕیم ،
با لە پاشان نەلێ :
کولك بلیجانی بە شەودزی ، بردی . »
کولك بلیجانی دێنێ .
خولام دەچێتە کن عەمەر ئاغای ،
تێکی ئەو خەبەرەی ڕادەگەیێنێ ،
« عەمەر ئاغا هەم کەڕە ، هەم گێژە »
هەر ئەودەمی ، کاتێکی ومردەك ، کاغەزی
ئەبۆ حەوت برای هەناردبوو ، کاغەزی ڕاوەگاتێ ،
عەمەر ئاغا هۆزی خۆی دەنگ دەدا ،
بانگی هەر حەوت برای ومردەك دەکا ، دەیانهێنێ .
هەر حەوت برا مێرخاسن .
ئەسپی ژێریان بۆزی خالخالین
تەنگەیان وەکی تەنگەی تاژی ژاروباریك ،
سمیان خشت‌و سمقۆتین ،
گوێیان وەك گوێی قەمچی قوت‌و قیتن ،

کلکە قەلوونەکانیان هێندەی گەزی حەلەبی‌یان درێژن ،
سەرکیان زۆر زەلامن ،
هەریەك ئۆقە تووتنێکی مووشێ دەگرن .
لە ڕۆژی تووش‌و دژواردا ،
وەك گورگ لور دەبنە دژمن ، تێیان ڕۆدێن .
برای گەوره کاغەزی ومردەك ومردەگرێ ،
بە روونی لێی حالی دەبێ ،
جەردەو هەر شەش برای تەفرە دەدا ،
بە لایەکی دیکەیاندا دەنێرێ ، گومڕایان دەکا ،
بۆ خۆشی بەرەولای کولك داژوا ،
تا کولکی خوارزای بە دلی خۆشەوه ،
بەرەو هۆزی عەلیی گێسی بنێرێ .
برای گەوره دەچێتە کن کولك ،
دەلێ :

**ــ خوارزا ، بڕۆ ، ئۆغرت خێر بێ ،**

**ئەمن جەردەم تەفرەداوه ،**
**بە لایەکی دیکەمدا ناردوون ،**
**تا ئەتو بلیجانی ببەی ،**
**تا ئەتو سەرفرازو ئازادبی ،**
**کولك دەلێ :**

**ــ خالۆ ، ئەمن پیاوی شەودزیێ نیم ،**

**بلیجانی بێ شەڕوشۆر ببەم ،**
**پاشان خەبەر بە عەلیی گێسیی بگاتەوه ،**
**بلێ :**

**ــ کولك بلیجانی بە شەودزیێ فڕاند .**

**خال هەرچی دەکاو دەکۆشێ کارێکی لە کولك ناکا .**
کولك دەلێ :

ــ خالۆ ئامادەبە ،

با بە شەڕ بێین ،
خال‌و خوارزا لەم قسانەدا بوون ،
هەر شەش برا بەسەردا دێن
کولکی برا مێرخاسە ،

کی
لە خالی گەورەی دێتە پارێزی ،
خالی گەورەی لە سەر زین دەڕفێنێ ،
کی
هەر شەش برای دی خۆدەگەیێننە کولك ،

کی
کولك گورج خۆتەیار دەکا ،
کی
تا لە هەر شەش خالآن ڕۆبێ
کی
سۆسکی بۆ نایەتە ڕایێ‌و دەوەستێ .
کی
هەر شەش برا مێرخاسن .
کی
هەر یەك نێزەکی لە کولك دەدەن ،
کی
کەر هەلیان دەکاتێ ،
کی
لە هەر شەش خالآن دێتە پارێزێ ،
کی
دوو خالآن لە سەر زینی دەرفێنێ ،
کی
مرتب دێتە بەر مەیدان
کی
دێتە پارێزی خالی کەرو کولك ،
کی
خالێکیان لە سەر زینی دەرفێنێ ،
کی
ئەوجا بغدو دێتە بەر مەیدان ،
کی
لە خالی کەرو کولك دێتە پارێزێ ،
کی
ئەویش خالێکیان دەرفێنێ .
کی
ئەوجا ئازاری سێیەم دێتە کار ،
کی
ئەویش خالێکی دیکەیان دەرفێنێ ،
کی
نۆرە دێتە سەر ئازای چوارەم ،

کی
ئازای چوارەمیش هەلدەکاتێ ،
کی
خالی کەرو کولك بە دەوری
کولکدا دێنێ‌و دەبا ،
کی
کولك گاز دەکا ، دەلێ :

**ــ کەرۆی برا ، بەسە ،**

**ڕیشەی خالوان دەرمەهێنە ،**
**خالت مەکوژە ،**
**با دلّی دایکمان لێ‌نەڕەنجێ ،**
کەر خالی دێنێ ،
ددانی دەردەکێشێت
لە هەنیەی دادەکوتێ ،
لەبۆ عەمەر ئاغای دەنێرێ ،
کەر دێتە کن کولك دەلێ :

ــ کولك ئەمن نەمزانی ئازایەتیی تۆ چبوو ؟

سبەی ومردەکی دایك دەلێ :

ــ کەر ترسەنۆك بوو ،

ئازایەتی هی کولك بوو .
کولك دەلێ :

ــ کەرۆ سۆسکێم لەبۆ بێنە ،

کەر سۆسکێی لەبۆ دێنێ ،
شیری هەلدەکێشێ ،
هەر چوار پەلی سۆسك دەپەڕێنێ ،
کولك دەلێ :

ــ کەرۆی برا سۆسك لەو سەر ڕێگایە بەجێ مەهێلە ،

نەکو کیژو بووکی خێلی عەمەر ئاغای چاویان بە لاشەی کەوێ .
نەبادا بلێن :

تۆ چبوویەودەبێ چبی کە سواری سەر پشتت هێنـــد ئازاو
دلێر بێ .

کولك دەلێ :
ــ بەلێ ، کولکی برا ،
خۆزی لە خۆزیداران ئەتو سۆسکت نەکوشتبا ،

ناووبانگی منی لەوی دنیایێ جارداباً ،
کولك دەڵێ :

- بەسم لەو قسانە بۆ بکە ،

وەرە خەمو کولانت بۆ هەڵڕێژم .
ەتو تەرقیکم ئەبۆ هەڵبەستە ،
حەنازەی برای خۆت لە سەر پشتی ئەو وشترەی پێشێ دانێ ،
ێشمەی بلیجانم لە دەستی توندکە ،
سانێکم بەدەرخە ،
ەینێ وەردەکی دایك
دەپرسێ ، ئەوە چیە ؟ »
ەنگینێ گوناح گوناحی تۆ نیە ،
ستی‌یەکەی بە وەردەکی دایك بلێ ،
ێ لە پاش هەندێ ، کولك بوو بە لاوەگێڕی تۆ ،
کەڕو هەر چوار کەڵەمێردان
ەرمێ بۆ کولك سازدەکەن ،
کونکی تێدەخەن ،
لاشانی لە تەرمەکەڕا بەدیار دەخەن ،
ێشمەی بلیجانی لە مەچەك دەئاڵێنن ،
ەروانیان بەڕێ دەکەوێ ،
ەر کە دەگەنە تخووبی خێڵی عەلی گێسی‌یێ ،
حەبەر بۆ عەلی گێسی دەنێرن ،
دەڵێن

- عەلی گێسی ،

کولك بلیجانی بە دلی خۆشەوە هێناوە ،
وەردێی دایك دووربین هەڵدەگرێ ،
دەڕوانێ ،
کاروانی مێرخاسان دەبینێ ،
دەمێنێ ،
ەر جارناجارێ بە دووربین دەڕوانێ ،
کاروانەکە دەبینێ ،
هەموو شتێنکی الێ ئاشکراو ڕوون دەبێ ،
وەردێی دایك دەڵێ :

**- هۆ عەلی گێسی ،**

**هەی سیاماڵ بەدەربی ،**
**کوڕت جوانەمەرگ بی**
**ئەمن دەمزانی کولك بەرەو خێڵی عەمەر ئاغای بچێ ،**
**سەر سەلامەت وەناگەڕێ .**
ەوجا عەلی گێسی‌و وەردێی دایك بەرەوپیری کاروان دەچن ،
وەردێ بە گۆرانی گوتنەوە دێتە بەر مەیدانی شەڕێ ،

دەلی :

- هۆ عەلی گێسی ،

هۆ ماڵوێران ،
ئەمن پێم نەگوتی ،
لە ڕۆژی تەنگانەو دژمنکاریێ ،
کەڕ هەڵدێ .
کولك بێ‌پشتەو پەنا دەمێنێتەوە ،
کەڕ دەڵێ :

- هۆ وەردەکی دایك ،

بەسم بەر تیرو توانجان دە ،
کەڕ پیاوی هەلاتنێ نیە ،
وەردەکی دایك دیسان دەڵێ :
عەلی گێسی تۆ چدەڵێی ؟
تۆ بە گوللەکی دەمکوژی ،
کەڕ دەڵێ :

- وەردەکی دایك ،

بەسم بە بەر تیرو توانج دە ،
ئەگەر لە ڕاستی دەپرسی ،
بە ڕەچەڵەکتدا هاتوومە خوار ،
کە کەڕ ئەوەی وەبیردێنێتەوە ،
وەردەك لە بنج‌وبناوانی کار دەگا ،
ئیدی لێی ئاشکراو ڕوون دەبێ ، ماڵەباوانی کوێربۆتەوە ،
خاتوو پەرێشان دەڵێ :
وەردەك بەس بکە شین‌و گرینێ ،
ئەگەر کوالکت لە دەستی چوو ،
کەڕی برایت بۆ خۆش بێ ، عەمری درێژی بۆ وی بێ .
**هەینێ کەڕ بلیجان بۆ عەلی گێسی دەبا ،**
**خاتوو پەریشانی لێ‌دەستێنێ ،**
**حەوت شەوو حەوت ڕۆژان ،**
**لە دەهۆلی‌و زوڕنایە دەدرێ ، شایی دەکرێ ،**
**ئیدی :**
**ئەوان بەلای سەروکاری خۆوە چوون**
**ئێمەش لێروکانە بۆ خۆمان ماینەوە .**

---

**١ - عەمەرێ گێسی ناوی ( عەلی عەمەرێ گێسی)یە . هەندێ جار عەلی ، جارجار عەمەر ، ناوبەناویش عەلی عەمەرێ گێسی‌یە .**
**٢ - وەکی قوتی ڕێلكو خشتن .**
**٣ - بێجان هەر بلیجانەکەیە .**

# توانای و نوشکی وانەکانە ..!

مدحت بێخەو

١٠-١٠-١٩٨٢

دیبدەی تیژو زیتتـان ئەمڕۆ
لە پلەی تەم بەزێندایـە .!
هەمەڕەنگی ئەو دیو دیوار
لاتـان دیارو والآیە
گلپەی هەلآوی دەروونتان
پەنجە لە گەرمی خۆ ئـەدا
بۆ نەمانی بەسـتەڵەکی ڕێبەندانو
بەفری وەکو « سەکری سەکران » ![1]

*

گوێتان ئاشنای بانگی حاجی‌و[2]
سۆزی دمدمی مەردانە
ئاشنای ( مەتاریزەی ) ئەرکو[3]
لاوکی ( قایفـان )ی مەیدانە[4]
کەوا زەنگیان ..
بۆ هەنگاوە شەکەتەکان ..
بەرەو لووتکە تین‌و هانە ..!

*

بۆکەمەر بەستنی ڕاستی ..
دەریای گەنجینەی پێشینان
وانەی زێری بەردەستتانە
چەپکە شۆڕکەکەی باپیرمان
پەندی هەتاسەر زاڵبوونەو
نوبشکی گشت وانەکانە .!

---

١ ـ سەکری سەکران : کیویکی سەختو بەفرینە سەر بـە قەزای چۆمانە کە هەرگیز بەفری لێ رەش نابیتەوە .

٢ ـ حاجی : حاجی قادری‌کویی .

٣ ـ مەتاریزە : گورانێکی پالەوانیەتیە .

٤ ـ قایفان : جۆرە لاوکێکی پالەوانیەتیە لە دووانزە سـوارەی مەریوان نووسراوە .

---

عەباس هەورامی

هەولێر ٦-٢-١٩٨١

# کوردستانم هەموو کاتێ هەر شیرینە

## ١ ـ بەهار

خاکم دیمـەنی هـەردەم شـــیرینە
دەشـــتو هەردوو کێو جوانو ڕەنگینـە

هەر چوار کژەی ساڵ جێگەی سەیرانە
هەوارگـەی جوانی دۆستو یارانــە

بەهاران خۆشـە گەشــتی لانـــزار
خوڕ خوڕ قەلـبەزەی بەفراو بێتــە خوار

چنووروو شەوبۆو سوور هەڵاڵەی سوور[1]
تێکەڵ بەقایــپە قاسپی کەوی دوور

خـــەموو پەژارەی دڵ ئەباتـــەوە
لەدەروون خونچـــەی گوڵ ئەکاتــەوە

---

١ ـ سوور هەڵاڵە : گولێکی زۆر سوورو جوانە ، بۆنەکەشـی تابلێی خۆشە بەزۆری لە شاخە بەرزەکانی هەورامانـا بەهارانە پەخش ئەبێ .

ئاوازی مەلی خنجیلەو ڕەنگین
کامە مۆسیقا وا خۆشەو شیرین

شەپۆلی گیا بەدەم سروەی با
هەزاران دەردوو ئازار لا ئەبا

گەر ڕۆژێ ڕێکەوت بەیادی جاران
لەگەڵ دۆستانو هاوسەروو یاران

بۆ سەیران ئەم جار ڕووکەینە نزار
بۆلای دیمەنی گولولالەزار

تاوێ بنۆشین شەرابێکی ئاڵ
لەداوێن چیای ڕەنگینو خاڵ خاڵ

تەنیا ئەو ساتەم پێی ئەڵێم ژینە
بەم جۆرە ژینم لەلام شیرینە

## ٢ ـ هاوین

باخی ڕازاوەو ئاوی سازگار
ئاوازی مەلان بەجۆش‌تر لەتار

سروەی شەمالی فێنكو بۆن خۆش
مرۆڤ بەبێ مەی زوو ئەکا سەرخۆش

لە لێوار چەمی خوڕوو سەرەو لێژ
پەلە چناری سەوزی زۆر درێژ

لەسێبەریا پۆل پۆل نازداران
ئاهەنگ ئەگێڕن دۆستو دلداران

سەرچاوەی کانی سازگاروو ڕوون
چارەو دەرمانە بۆ دەردی دەروون

گولو گولزاری زەردوو سووروو شین
پەپوولەی ڕەنگین لای خونچەی نەخشین

ئارامی گیانە سەیرانی ئەوان
بۆ مێشك زاخاوەو بۆ دەردیش دەرمان

یا هاژەی تاڤگەی بلندی زیوین
لە داوێن شاخی شوخو نازەنین

هاوینیش ڕووی شاخ هەروەك بەهارە
لەدوور دار بەڕوو قەزوان دیارە

بەدار بەڵاڵووو دەوەندی بچووك
ڕازاوەتەوە شاخ هەر وەکو نەوبووك

هاوینە هەوار هەردەم ئاوایە
بەڕاست بەهەشتی سەر ڕووی دنیایە

## ٣ ـ پاییز

تك تك دلۆپی زیوینی باران
چپە چپەتی بۆ گەڵای داران

دار گوێیژی شۆخ چەند نازەنینە
گەشەی هەزاران دلوو ئەڤینە

چەند جوانە بەرگوو خشڵی زێرینی
بە سروەی شەماڵ ورد ورد لەرینی

لەنجەی بۆ ئەکا لەبەر بارانا
کەوتوەتە سەما لەگەڵ یارانا

یاخۆ دار بەڕووی قیت قیت ڕاوەستاو
شۆخو باڵابەرز پرچ تازە شۆراو

مەلی ڕەنگاو ڕەنگ پەلووباڵ تەڕبوو
ئاوازی پڕجۆش فڕینی زوو زوو

بەستەی ئازادیو سەربەستی ئەچڕێ
چەند کامەرانە بۆخۆی کە ئەفڕێ

وا لەسەر کێوی ڕوو زەرد هەڵگەڕاو
جۆگەلەی لێژی باریك پڕ لەئاو

خوڕ خوڕ بەرەو خوار بۆ لای چەموو دۆڵ
بۆ باخی هەرمێو هەناروو بێی چۆڵ

گەڵای زەردی دار لە هەوا فڕیو
ئامۆ شۆیەتی لەم دیو بۆ ئەو دیو

کاتێ کە شەماڵ ئەوەستێتەوە
جا کەمێ ئەویش ئەحەسێتەوە

هەزاران خەمی دڵ ئەباتەوە
هۆشو ئەندێشەو بیر ئەکاتەوە

## ٤ ـ زستان

لە زستان لووتکەی بەفرین ببینە
چیای خاڵ خاڵو شیرین ببینە

گوێ بدەرە هاژەی قەڵبەزەی زۆر خوڕ
بەرەو لای بۆ لای داری چڕو پڕ

نەمام کە بەرگی زیوین ئەپۆشێ
چەشنێکە تەواو دڵ بۆی ئەخرۆشێ

قاسپە قاسپی کەو لە کێوی بەفرین
چەندە بەسۆزەو خەم ڕەوین شیرین

جێ پێی کەروێشکی نەشمیلەو نازك
یا بزنە کێوی یاخۆ هی ئاسك

وەك نەخشە بەسەر بەفرا دیارە
هەر نابڕێتەوە هەزار هەزارە

سەیرکە دیمەنی کلیلەو هەرەس
بزانە بۆ سەیری دڵ ئەکا هەوەس

ئەم کوردستانە شیرینو جوانە
هەر کاتوو هەردەم جێگە سەیرانە

وڵاتم خاکی چەندە شیرینە
ڕاستە بەهەشتی سەر ڕووی زەمینە

تەواو بێ‌گەردە خاکی کوردستان
بەهاروو هاوینو پاییزو زستان

# بۆ ڤیێنا

عومەر دزەیی
ڤیەنا
شەوی ۱۹۵۷/۱۱/۱۱

**... لەگەڵ کیژۆلەیەکی ((ئۆتریشی)) حەزمان لێك دەکرد لەپڕ ، وەتەنها چەند ڕۆژێك پێش بیرەوەری ڕۆژی لەدایـــك بوونم ـ کە بە تەمابووین پێکەوەی بەرینە سەر ـ دڵی ناسکی شکاو لێم زیز بوو . منیش ئەو شەوەم ،بە تەنیایی لەگــەڵ یەك گۆسکە شەرابی سوورو دوو پاکەت جگەرەی ســـمارت بردە سەر .**

**هەستو خوستی دڵو دەروونی خۆم بەم جۆرەی خوارەوە هەڵڕژاند :**

■ ❋ ■

ئاوازی کام ژێیە لە گوێما دەنگ ئەداتەوە ؟
شەپۆلی کام زێیە لە سنگما پەنگ ئەداتەوە ؟
بۆنی کام گوڵ ؟
لەرەی کــام چڵ ؟
ئەخورپێنێ دڵ !

■ ❋ ■

سـەرنجم گرت دڵم وادێ(۱) تەماویو پەستو شـــیواوبێ
وەکوو سەنگی‌ی هەموو گێتی بەســەریا کــەوتبێ وابێ
ئەناڵێنێو ئەدا پــەل وەك نێچیری کــەوتە ناو داوبێ
یا وەك دارێکی تینوو تاقــە ئاواتی یــەك قومی ئاوبێ

■ ❋ ■

دڵە : چاك تێت ئەگەم بۆیە منیش وەك تۆ پەشـــێواوم
لە فرمێـــسکی گوڕو گەرمم گەلێك ڕشت ، بۆیــە کزە چاوم
شـــەوانی بەزمی جارانم بەسەرچوو بۆیە دامـــاووم
هەزار داخ کورتبوو ئەو خەونەی کە ئێستا وا لێی هەڵساوم

■ ❋ ■

ئەزانی ئێستە پیشەی من هەمیشە کاری بەدکـــــارە ؟
شـــەوانم هەر لە مەیخانان ، بەڕۆژ بێهۆشو ئـــاوارە
هــەڤاڵانم هـــەموو تۆران ، تەنانەت خۆم لێ بێـــزارە
بەڵام توخوا مەکــەن لۆمەم ، بڵێن : قەینــاکە ، دڵدارە

■ ❋ ■

هەموو هەستو هەموو کاتم هەتا توانی ، هەمووم دایێ
لە پێشی هەر ژوانێکا هەزار جار : خوایە دێ .. نایێ !
لەباخی شار(۲)، لەسەر دانووب(۳)، لەژێر هەر دارو پەنایێ
گــەلێکم مژت لـــە لێوانیو گـــەلێش ئامێزی باڵایێ

■ ❋ ■

لەباسی چاوی پڕ ئـــاوی : بڵێم داوە ! ئـــەرێ تۆڕە ؟
لە نەرمی‌ی لێوو شـــیرناوی : هەموو نەرمێ سەری شۆڕە
لەبۆنی پرچەکەی خاوی : گوڵاڵەی دەوری بەستۆڕە(٤)
لە بەژنی شـــلکی لاولاوی : هەتا خوا حــەز ئەکا شـــۆڕە

■ ❋ ■

لە ئاســۆی ژینی پـــڕ هیوام وەکو مانگێکی هـــاوێنی
کەوام زانی بەرەو سەرما ئەکشێ ، ڕوونـــاکیم بۆ دێنی
کەچی تۆمــەز کە ئەو مانگە لە زەردەی ژینی وەك خوێنی
دڵم بوو ، ها .. کەوون بوو ! یـــا .. دڵەی ساوام کێ ئەینوێنێ ؟

■ ❋ ■

بەڵێ! ڕۆیی .. لەدەس چوو ، کۆترەکەم ڕۆیی بەدەم باوە
هێلانەی دڵ لەپاشی ئەو ، ئەوا وێرانو ڕووخـــــاوە
گوڵی گوڵدانەکەی ژینم لـــــە بۆێ سیسو ژاکـــاوە
بە کورتی ژینی پاشـــی ویم لەنـــاو تاریکی دامـــاوە

■ ❋ ■

بەڵام دوور یا نزیك ، شەرت بێ لەبیرت قەت نەکەم تاوێ
وەفاداریم منت ویـــــت ، هەروەهــا گەرتۆ منت نـــاوێ
ئەگەر نەش‌بین بە هاوســەر،خۆ ئەمن تازە..ئەمن هەر:
بە بەهرەی تۆ
بە چەهرەی تۆ
دەکا هەیبی هونەرمەندیم لە دڵ سمکۆڵو پڕتاوێ

**۱ ـ وادێ : وا خەریکە**
**۲ ـ باخی شار : بە ئەڵەمانی (( شتات پارك )) باخێکی ئێجگار خۆشو جێی ژوانانە لە شاری ڤیەنا .**
**۳ ـ دانووب : ئەو زێیەیە کە بە ناو ڤیەنەدا تێپەرر دەبێ .**
**٤ ـ بەستۆرە : بەستێکە لە نێوان هەولێرو چیـای پیرمام، سەیرانگای بەهاری خەڵکی ئەو ناوچەیەیە .**

ملا کچکه عەبدوڵڵا مفتی
شقلاوه

# کاتێ خۆشەویستی ئەدوێ

خۆشەویستم ....
ئەستێرەکان
لە شەواندا ناجریوێنن !
شـالوورەکان
مانیانگرتوەو ناخوێنن !
پەپولەکـان
ناتوانن یەکتر بدوێنن !

لەبەر ئەوەی زۆر لە مێژە
لەم ماوە دوروو درێژە
بەبـێ سـۆراخ
یادێکی تۆم نەبینیوە
لە حەزی بیرەوەریتا
لە ئامێزی دلداریتا
دڵەی پڕ ئاخ
بەرهەمێکی نەچنیوە
هیواو ئاواتی نەدیوم
ژیانی بێکەسیی هەتیوم
لە هەستو ناخ
بۆ شادی پێنەکەنیوە !

●

خۆشەویستم ....
وەك چۆن کێڵگە لێرەو لەوێ
بارانی پەڵەی خۆش ئەوێ
کەوو سوێسکەی شاروچکەکەم
هەرگیز بەبێ کەژ ناسرەوێ
کۆرپەی ساوای ناو بێشکەکەم
بەبێ لایلایە ناخەوێ
هەر بەم جـورە
دڵەی پڕ زامو ئێشەکەم
فەرامۆشیی لێناکەوێ !

●

خۆشەویستم ....
هەتا ئەمرم تۆ ئاواتمی
پەرستگاهی هەموو کاتمی
بیرو ڕاکەم نەگۆڕاوە
ناوت لە دڵەی زووخاوم
لە سەر دەروون و هەناوم
چەشیی مۆرێك هەڵکەندراوە
یا چۆن کۆرپەی فەرهادی خەم
حەز لە باوەش شیرین ئەکا
هەروا سەرمەستیٚ کاکەمەم
حەز لە مەی چاوی زین ئەکا
وەکو ئەوان دێوانەی شەم
حەز لە یاری ئەوین ئەکا
دەسا باوەڕ بکە هەردەم
منی شەیداش هەتاکو هەم
ژینم بە بۆنت بەستراوە !

●

خۆشەویستم .....
ناحەزەکانمان دەتوانن
کە لە مێژە چاوەڕوانن
چەند دروو دەلەسەیەك هەن
دژی نێوانمان ڕێك بخەن
دڕکو داڵێکی بێشوومار
زەردەواڵەو دووپشکو مار
یەکەیەکە بخەنە کـار
ڕێگای ڕاستمان لێتێك بدەن
بەلام با باش ئاگادار بن
لەوەش زیاتر شێتو هار بن
ڕەگی قووڵی دلداریمان نابڕێتەوە
وشەی سۆزو خۆشەویستی ...
لە ناو هەستمان ناسڕێتەوە !!





# پیرۆزبایی بۆ گۆڤاری کاروان

لە ۲۲/۱۰/۹۸۷

[illegible] لە سلێمانی دراوسێی گرتووخانە

سەیرێکەن گۆڤاری کاروان وا لە هەولێرەوە دەرچووە     بالە پێشوو لێکەم پیرۆزبایی تازەوە

عەرەب بیو کوردی دەنووسی دووبرالی هەڵچووە     نیشتمانی ئێمە کوردی تیا بروزی سەندووە

خۆ لە شوێنانی ترا کوردی زمانە و مردووە

لێ بە هاواریان تکایە ئەی خوای هەردوو جیهان     رزگاریان کە لە ژێر چنگ و چەپۆکا کوردەکان

لێ گوناهو سووچە کەوتن و ابە لێ جێگە و مەکان     بۆی بەرخسینە نەجات بن خێوی ئەرز و ئاسمان

هەر بە تۆ دەکری دە ترانم بێن بە فریادی ئەوان

باکەم پیرۆزبایی من لە ئێوە [کاروان]     چاپکەنە ئەم چەند هۆنراوە ڕووبە کوردی هەندەران

تا تەماشای کەن تەواوی ژیر و زانا کانیان     لێ بگرن لێ بەش کراون گشت لە نووسین و ژیان

ڕەنگە بیزانن هەمووتان ئاشکرایە بێگومان

شیعر و پەخشانی مندە سامانی کوردی قارەمان     هێندە بەشدارم تیا تا دێتە سەر لێو و زمان

دووزگێرە مەلای گەلە بۆ پیر و گەنج لاوەکان     کوردم و بۆ کورد دەنووسم تا لە لەشما بێ گیان

کوڵ لە نووسین نادەم هەرگیز هۆنراوەتیری پاڵەوان

خامە دانانێم ئەمن خۆ ڕۆژ و شەو لەیل و نەهار     کات ئەگەر هاوین و پاییز بێت و زستان و بەهار

هەر دەنووسم بۆ برادەر خۆشکم قەتارە ئەندە قەتار     جێ بمێنی بۆ گەلی ئازیزی کوردم یادگار

چیم لە هێز و ئیرادا بێ کاری پێکەم کوردی بە کار

کورد لە عیراقا ئێستا باش ئەگەری بۆ خۆی تەواو     دەم بەرە للایە لە نووسینا بە کوردی چاپ کراو

خاوەنی گۆڤار و ڕۆژنامەن تەماشای کەن بە چاو     بێ زمانن خۆ لە شوێنانی ترا گشت بەش خوراو

تا دەگوکەی / بێ دە بێ دادی خوا داپێکراو ؟؟

# ڕێنووسی کوردی لە ڕەگ و ڕیشەوە

د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف

خزمەتی شانازی پێوەکراوی مامۆستا مستەفا نەریمان لە مەیدانی گەورەی گەڕان بەدوای کتێبی کوردیدا شایانی ئەوەیە چەپکە گوڵی وەفای پێشکەش بکرێ . نامیلکەی « کتێبخانەی کوردی » ( ١٩٥٩ ) و کتێبی « بیبلیۆگرافیای کتێبی کوردی » ( ١٩٧٧ ) و گەلێ وتار لە ڕۆژنامەو گۆڤارە کوردییەکاندا لەم بەتەوە ڕێگەی درێژی گەڕانو سۆراخ کردن و پرسیار بەدوای سەرچاوەی نووسینی کوردییاندایان بۆ خوێندەوارانی کورد کورت کردۆتەوە و بەڵگەی زرنگی نووسەرن لە هەڵبژاردنی کاردا ... کتێبی « ڕێنووسی کوردی لە ڕەگو ڕیشەوە »ش ( ١٩٨١ ) بەردەوامیی هەوڵو تەقەلایەتیو نیشانەی بەرەو پێشەوە چوونو فراوانبوونی ئاسۆی بیرێتی.. بەڵێ لێکۆڵینەوە لە پەیدابوونو گەشەکردنو جۆرەکانی نووسینی کوردی گرانترە لە بیبلیۆگرافیای ڕووت ، چونکە جگە لەوەی دەبێ دەمی پەیدابوونی هەر دیاردەیەك دەستنیشان بکاتو پوختەیەکی مێژووی نووسینەکان ڕوونبکاتەوە، هەروەها لە بارەی بەشێك لەو بەرهەمانەشەوە کە لەبارەی ڕێنووسی کوردییەوە نووسراون ، پێویستە هەندێ نرخاندنو ڕەخنەو هەڵسەنگاندنی تێدابێ .

بێگومان نووسینی مێژووی ڕێنووسی کوردی کارێکی یجگار گەورەو بایەخدارەو بۆیە بێ سێو دوو دەڵێم ، ئەو کێشەیەی مامۆستا نەریمان لێیداوە باسێکی زۆر پێویستو گرنگە .. بەڵام ئەوەی پێوەندی بە چۆنیەتی بەجێهێنانی ئەرکەکەوەیەتی ، بەداخەوە تێیدا سەرنەکەوتووە .

ئەم بەرهەمەی مامۆستا نەریمان ـ « ڕێنووسی کوردی لە ڕەگو ڕیشەوە » ( بەغدا ، ١٩٨١ )(١) ، کە کتێبێکی ( ٦٨ ) لاپەڕەیەو لەسەر ئەرکی دەزگای ڕۆشنبیریو بڵاوکردنەوەی کوردی چاپکراوە ، ئەگەر چی هەندێ زانیاریی وای تێدایە ، کە تا ئێستا باسیان نەکراوە ، بەڵام هەڵەو نادروستیو شێواندنی ڕاستی ، ناتەواویو کەمو کورتی ، سادەییو ساکار ...ی ئەوەندە زۆرە کە بەڕاستی ، بەرلەوەی بیخوێنمەوە چاوەڕوانی ئەوەم لێ نەدەکرد .

یەکێ لەو زانیارییانەی شایانی باسە ، خستنە پێش چاوی ئەو هەوڵە گەورەیەیە کە لە سازاندنی ئەلفوبێی عەرەبی بۆ نووسینی کوردی لە لایەن یوسف ضیاءالدین پاشای خالدییەوە دراوە . ئەویش ئەوەیە کە لە چاپکردنی فەرهەنگی « الهدیه الحمیدیه فی اللغه الکردیه »دا(٢) بۆ نیشاندانی دەنگی ( ۆ ) و ( ێ ) لە ژێر نیگاری ( و ) و (ی) دا نیشانەی (٨)ی داناوە . من لێرەدا پێ لەوە دەنێم کە زووتر هەستم بەو هەوڵەی یوسف ضیاءالدین پاشا نەکردبوو ، بەڵام لە ڕێی کتێبی ناوبراوی مامۆستا نەریمانەوە ، کە لە لاپەڕە (١٧ ـ ١٨ ) دا باسی کردووە ، لێی ئاگادار بووم .

نووسەری کتێبی « ڕێنووسی کوردی لە ڕەگو ڕیشەوە » زۆر ڕاست بۆ ئەوە چووە کە ساڵی ١٩١٩ بۆ یەکەم جار لە هەر

چوار ئنجیلەکان ( مەرقۆس ، لۆقا ، مەتتی ، یوحەننا )دا بۆ نیشاندانی (ل)ی قەلەو حەوت خراوەتە سەر پیتی لام ( بڕوانە: ل ١٩ ) . بێگومان گلەیی لە مامۆستا نەریمان ناکرێت ، کە ئاگاداری ئەوە نییە لە کتێبی ( ڕێزمانی کوردی )ی ل.و. فۆسسومیشدا کە هەر ساڵی ١٩١٩ چاپکراوە(٢) هەمان دیاردەی دانانی چوکلە بۆ نیشاندانی (ل)ی قەلەو بەکارهاتووە.

ئەگەرچی ئەو جۆرە زانیارییانەو هەندێکی دی لە کتێبی « ڕێنووسی کوردی لە ڕەگ‌و ڕیشەوە »دا بەرچاو دەکەون ، بەڵام بەداخەوە گەلێ شوێنی تری کتێبەکە جێی ڕەخنەیە :

ئەو نووسەرانەی دەربارەی ئەوە نووسیویانە کە لە کەیەوە کورد دەستی بە بەکارهێنانی ئەلفوبێی عەرەبی کردووە ، بێ ئەوەی هیچ بەڵگەیەکی زانستییان بە دەستەوە بێ ، بێ سێ‌و دوو مەسەلەکە دەگەڕێننەوە بۆ سەردەمی پەیدابوونی ئیسلام لە کوردستاندا . هەرچی مامۆستا نەریمانیشە وای دەربڕیوە، کە گەلی کورد « لەوساوە کە ئاینی پیرۆزی ئیسلامی قبووڵ کردووە»، نەك هەر « پیتی عەرەبی لە نووسیندا بەکارهێناوە»، بەڵکو کتێبیشی « پێ چاپکردووە » ( ل ٦ )... نووسەر لەم بە رهەمەی ( ل ١٩ )و لە کتێبی « بیبلیۆگرافیای کتێبی کوردی »دا ( ل ٤ ) ، دیاری کردووە کە یەکەم کتێب سەرتاپای کوردی بێت‌و بەئەرکی کورد چاپکرابێت کتێبی ( ئەنجومەنی ئەدیبانی کورد )ی ئەمین فەیزی بەگە ، کە ساڵی ١٩٢٠ لە ئەستەموول چاپی کردووە. جا کە تەمەنی یەکەم کتێبی چاپکراوی کوردی لە لایەن کوردەوە نزیکەی شەست ساڵێك بێت‌و کەچی کوردیش پتر لە هەزار و سێ‌سەد ساڵ لەمەوبەر ئاینی ئیسلامی وەرگرتبێ ، ئەوە بێگومان نێوانی واقیع‌و ئەو جۆرە خەملاندنە ئاسمان‌و ڕێسمانە .

کۆنترین سەرچاوە کە ئێمە بینیبێتمان‌و ئەوەی تێدا بەدی بکرێ کە نیگاری ( ە ) و (ی) و (و) بۆ سەرو ژێرو بۆر بەکارهێنرابێ دەستنووسی ژمارە ( ٤٤٨ )ی کتێبخانەی کۆڕی زانیاری کوردە . ئەم دەستنووسە ساڵی ١١٩٩ی ك ، واتە ١٧٨٥/١٧٨٤ ز لە لایەن سەعید عەبدوللا موکرییەوە نووسراوەتەوە(٤) . لە هەندێ سەرچاوەی کۆنی دیدا هەمان دیاردەی بەکارهێنانی نیگاری ( ە ، ی ، و ) دەبینرێ ، بەوێنە: لە « عادات‌و رسومات نامەی اکرادیە »ی مەلا مەحموودی بایەزیدیدا(٥) ، بڕوانە : ( ل ١٩٧ ، د٣ ـ « نەبویە » )، (ل١٩٩، د٤ ـ « زیدە » ) ، ( ل ٢٠٢ ، د٦ ـ « بونە » ) ... (ل١٩٨، د٣ ـ « مروڤکی » ) ، ( ل ١٩٨ ، د٩ ـ «کسکی » )، (ل٢٠١ ، د٦ـ « بابکی » ) ... ( ل١٩٦ ، د٢ ـ « کوردی » )، (ل٢٠١، د١٢ ـ «کورد» ) ، (ل٢٠٢ ، د٨ـ « کوردستان » ) .. هەروەها لە گۆڤاری « کوردستان »دا(٦) ، بڕوانە : ( ژا ، ل١ ، س١(٧) د٦ و ٧ ـ « چە دبە نابە » ) ، ( ژا، ل٢، س١، د١٣ـ « نەخونە » ) ، ( ژ١ ، ل٣ ، س ٢ ، د ٢٣ ـ « امرکرنە » ) ... ( ژا ، ل١ ، س٢ ، د٤ ـ « جریدەکی » ) ، ( ژا،ل٣،س١، د٨ ـ «صنعتکی» ) ، (ژ٢٣ ، ل٢، س١ ، د٢٦ـ «روژکی» )... (ژا ، ل٤ ، س٢ ، د٥ ـ «توجارا » ) ، ( ژا ، ل٤ ، س٢،د٩ـ « کوشتن » ) ، ( ژ٢٣ ، ل١ ، س١ ، د١٥ ـ « چونکە » )... هتد .

شایانی باسە ،ئەم دیاردەیە ـ واتە نووسینی ( ە )و (ی)و (و) لەجیاتی سەرو ژێرو بۆر ـ کە لە دەستنووس‌و چاپەمەنی زووی کوردیدا ناوەناوە ڕەچاوکراوە ، لە ڕۆژنامەی«تێگەیشتنی ڕاستی »دا(٨)باش پەرەی سەندووە ئەگەر چی ئەمە وەك کارێکی سەرەتایی هەموو وشەکانی نەگرتۆتەوەو گەلێك وشە هەر لەسەر شێوەی کۆن نووسراون ، بەڵام لە گشت لاپەڕەیەکدا چەندین نموونەی جوان‌و لەبار دەبینرێ . بۆ پێ‌سەلماندنی ئەو وشانە هەر لە لاپەڕە (١)ی ژمارە (١)ەوە وا چەندین نموونە دەخەینە پێش چاو : ( د٦ و ٧ ـ « تاقی‌کردنەوە » )، ( د٨ ـ « هەمیشە » ) ، ( د ٩ـ « امیددەکەین » ) ... ( د٢ ـ « تیگەیشتنی راستی » ) ، (د٣ـ « اقوامی عالم » ) ، (د١٠ ـ « چاکەی حکومەتی بەریتانیا » ) ... ( د٧ـ« کورد » ، (د١٣ـ کوشتن » ) ... هتد .

سەرەڕای پەرەسەندنی دیاردەی بەکارهێنانی ( ە )و (ی)و (و) لە بریتی سەرو ژێرو بۆر لە « تێگەیشتنی ڕاستی »دا ، هەروەها پێویستە ئەوەش لەیاد نەکەین ، کە ئەو ڕۆژنامەیە یەکەمین چاپەمەنی کوردییە بە نووسین پەنجە بۆ ئەو پێویستییە ڕابکێشێ‌و لەبارەی بایەخ‌و کەڵکییەوە بدوێ‌و لە ژێر سەرباسی « بعض اصطلاحاتی کوردی » دا بڵێ:«اوروپاییە بو خویندنی نووسینی زمانی شرقیەکان زور مشکلاتدەکیشن . ایمە لەبر امە کە ام مشکلاتە بەقدر امکان حل بکین امە صالیکە لە نوسینی کوردیدا بە موافقتی فن اثناکان بعض اصطلاحاتمان قبولکرد .

( سر ) و (بور ) و ( ژیر )ی حرفەکان بە (ە ) و ( و )و (ی) دەنوەسین :

لە باتی کردستان ( کوردستان )و لە باتی دکا ( دەکا)و لە باتی حکومت کورد ( حکومتی کورد ) و لە باتی موفقیت اوان ( موفقیتی اوان ) و همزەش بە ( ی ) دەنوسین . امە بی شبهە بو چاك خوندنەوەی نوسینی کوردی فائدەی زورە و کلی اصطلاحاتی تریشمان تصورکردوە اوانش الوقتی خویدا نشر دەکین »(٩) (١٠) ، (١١) .

چەند مانگێك دوای ئەو ڕوونکردنەوەیەی ڕۆژنامەی « تێگەیشتنی ڕاستی » ، گۆڤاری « ژین »ی ئەستەموول بە

ناوی « کوردجەحرفلری »یەوە لیستەی ئەلفوبێی کوردی بلاوکردموە(١٢) . لەو ئەلفوبێیەدا پیتە بزوێنەکانو پیتە کۆنسۆنانتەکان جیاکرابوونەوەو بۆ یەکەمیان (٨) پیتەو بۆ دووەمیان (٣٤) پیت دیاری کرابوون . لە نێو پیتە بزوێنەکاندا نیکاری ( ە ، ی ، و ) هەیە .

**سەرەتای سالی ١٩٢٧یش مامۆستا حسەین حوزنی موکریانی لە گۆڤاری « زاری کرمانجی »دا لەو بارەیەوە نووسیویتی : « قاعیدەیەکی کە لە گۆڤاری زاری کرمانجیدا قبوولکراوە بۆ نووسین ئەمەیە : حرف ( ە ) عەلامەتیسەرە، وەکو ( اەگەر ) و (و) عەلامەتی بورە وەکو ( بوت ) ، ( خوت ) ، ( رووت ) و ( ی ) عەلامەتی ژێرە وەکو ( ایدی ) .. »(١٣) .**

**کتێبی «دەستووری زمانی کوردی » ی مامۆستا تۆفیق وەهبی ( ١٩٢٩ )(١٤)وا چاپکراوە کە لە سەرانسەریدا نیگاری ( ە ، ی ، و ) لە جێ سەرو ژێرو بۆر دانراوە .**

وەك لەسەرەوە نیشانماندا دیاردەی بەکارهێنانی پیتی ( ە ، ی ، و ) بۆ سەرو ژێرو بۆر لە نووسینی کوردیدا نەمێژە سەری هەلداوەو سەرەڕای ئەوەش مانگی کانوونی دووەمی سالی ١٩١٩ ڕۆژنامەی «تێگەیشتنی ڕاستی » بە نووسین پەنجەی بۆ ئەو پێویستییە ڕاکێشاوەو مانگی مایسی ١٩١٩ گۆڤاری « ژین » ی ئەستەموول لە لیستەی پیتە بزوێنەکاندا نیگاری بۆ داناونو سالی ١٩٢٧یش گۆڤاری « زاری کرمانجی » لە ژمارە (٧)یدا ئەو دەستوورەی پەسەند کردووە ــ و مامۆستا تۆفیق وەهبیش سالی ١٩٢٩ لە چاپی کتێبی «دەستووری زمانی کوردی » دا بۆ خوێی چێشتیش سەرو ژێرو بۆری نەنووسیوە ... کەچی مامۆستا نەریمان کە لە ڕەگو ڕیشەی ڕێنووسی کوردی دەدوێ ، مێژووی دێرینی ئەو پیتانەی نەبینیوەو سالانی (٣٠)ی بەدەمی پەیدابوونیان داناوەو ئەو چەند دێڕەی سالی ١٩٣٣ لەسەر بەرگی کتێبی ( خورشیدی خاوەر ) لەو بارەیەوە نووسراوە بە « یەکەم بەردی بناغەی » ئەو کارە ژماردووەو واش ڕادەگەیەنێ ، لەو کتێبانەدا کە ( کوردیو مەریوانی ) لە سییەکاندا چاپیانکردبوو « یەکەمین جارە کە لە جیاتی ( بزوێن ) لە ڕێنووسی کوردیدا ( پیت ) بەکار هێنراوەو تا ئەمڕۆش پەیڕەوی کراوە بۆیە بە بەردی بناغەی ڕێنووس دادەنرێ » ( بڕوانە : ل ٢٤ــ٢٥ ) ... بەداخەوە باش وردنەبوونەوەی مامۆستا نەریمان لە دەستنووسو چاپمەنی کوردی بووەتە هۆی هەلەو نادروستی .

دوای ئەو پلەیە ئەوەی لە دەستکاریکردنی ئەو ئەلفوبێیەدا دەبینرێ ، پەیدابوونی نیگاری هەمزەیە : لە ژمارە (١٨)ی (گۆڤاری (ژین)ی ئەستەمووڵدا ، کە ٨ی مایسی ١٣٣٥ی لەسەر نووسراوەو کە دەکاتە ٨ی مایسی ١٩١٩ وتارێکی داوەر ئەردەلانی بە ناوی « چۆن بکۆشین ؟ » هوە هەیە ( ل ١٦ ) و لە نووسینی هەندێ وشەدا نیگاری ( ئـ )ی بەکارهێناوە ، بەوێنە : ( د٨ ــ « ئەمرد » ) ، (د١١ ــ « ئەم »)، (د١٣ ــ « « ئەمانە » )؛ (د١٤ ــ « ئەکوشین » ) ؛ ( د٢٠ ــ « ئەمندە ») ...(١٦)

شایانی باسەکە ئەم هەنگاوەی داوەر ئەردەلانی کاریکردە سەر هەندێ نووسەری گۆڤاری «ژین» بۆ نموونە یەکسەر لە ژمارەی داهاتوودا ــ واتە لە ژمارەی ١٩دا ، ٢٢ی مایسی ١٣٣٥ ك / ١٩١٩ ز ــ ع . ڕەحمی ، کەنووسەرێکی چالاکی ئەو گۆڤارە بوو لە زۆربەی ژمارەکانیدا بەرهەمی بلاوکراوەتەوەو لە هیچ یەکێك لە نووسینەکانی بەر لە ژمارەی ١٩دا پیتی ( ئـ )ی بەکارنەهێناوە ، کەچی ئەوەتە ، لەو شیعرەیدا کە بە ناوی « لوما ژ بلبل »هوە لە لاپەڕە (١٦)ی ژمارەی ناوبراودا چاپی کردووە ، بۆ نووسینی چەند وشەیەك پیتی ( ئـ )ی بەکارهێناوە . هەروەها کەمێ دواتریش لەکتێبی « هینکر زیمان کوردی » ( ١٩٢١ )دا(١٧) نیگاری ( ئـ ) زۆر بەرچاو دەکەوێ ، بڕوانە : ( ل٦ ، د٣ ــ « ئەو ، ئەمە ») ؛ ( ل١٧ ، د٤ ــ « ئەوان » ) ؛ ( ل١٩ ، د٣ ــ « ئەموست »)... لە کتێبێ « کۆمەلە شیعری حاجی قادری کۆیی »دا (١٩٢٥)(١٨) ، ( ئـ ) تا ڕادەیەك بەکارهاتووە ، بۆ نموونە بڕوانە : (ل٣ ، د١١ــ « ئەمش » ) ؛ (ل٣ ، د١٠ ــ « ئەوی » ؛ (ل٣ ، د١١ ــ « ئەخواست ، ئەم » ) ... لە کتێبی «ڕەووشتو خوو » دا ( ١٩٢٧ )(١٩) ، ( ئـ ) پتر ڕەچاوکراوە ، بۆ نموونە بڕوانە : (ل١ ، د٤ ــ « ئەوی ، ئەگەر » ) ؛ (ل١ ، د٧ ــ « ئەکەیت » ) ، ( ٤ ، د٧ ــ « دائەمێنێ » ) ... لەگەل ئەوەشدا هەندێ کتێبی ئەوتۆ هەن کە دوای ئەوانەی باسمانکردن ، چاپکراونو کەچی ( ئـ ) یان تێدا بەدی ناکرێ، وەك : «پێشوای آیین »( ١٩٢٧ )(٢٠) ... بەلام ئەمە هیچ لە مەسەلەی سەرەتای پەیدابوونی ئەو نیگارە ناگۆڕێ ... بەڕاستی جێێ سەرنجو داخە ، کە باسی ئەم دیاردە گرنگەی ڕێنووسی کوردی بە هیچ چەشنێك لە کتێبی « ڕێنووسی کوردی لە ڕەگو ڕیشەوە » دا نابینرێ.

نیگارێکی نوێی دی دوو واو نووسینە بۆ دەنگی بزوێنی

û . ئەم وێنەیە لە کتێبی « کۆمەلە شیعری حاجی قادری کۆیی »(٢١) و « قانوونی هەلبژاردن » دا (٢٢) ، کە هەردووکیان لە سالی ١٩٢٥دا بلاوکراونەتەوە ، دەبینرێ . بۆ نموونە لە کتێبی یەکەمدا ، بڕوانە : (ل٣ ، د٢ ــ « دوو » ) ؛ (ل٣ ، د١٢ ــ تاوەکوو » ) ؛ (ل١ ، د١٦ ــ « دوور » ) ... لە کتێبی دووەمدا ، بڕوانە : ( ل ١ ، د٥ ــ « قانوون » ) ؛

(ل٢ ، د٤ـ« محكوم » ) ؛ (ل٢، دوادێر_« دووهەمینیش»)..
دواتریش لە کتێبی « ڕەووشستو خوو»دا ( ١٩٢٧ )(٢٢)
بەکارهاتووە . بۆنموونە ، بڕوانە : ( ل٧٠ ، د٩ ـ «توورەیی»)؛
(ل٧٠ ، د١٤ ـ « سووك » ) ؛ (ل١٢٠ ، د٩ ـ «٠ دوو »)...
بەڵێ جێی ڕەخنەیە ، کە مامۆستا نەریمان بە هیچ کلۆجێك
لە بارەی پەیدابوونی ئەو پیتەوە نەدواوە .

بێگومان باسنەکردنو ناو نەبردنی دەوری مامۆستا
سەعید صدقی کابان کەلێنێکی گەورەیە لە کتێبی « ڕێنووسی
کوردی لە ڕەگو ڕیشەوە » دا . نووسەر دەبوو هیچ نەبێ
ئەوە یادداشت بکات ، کە لە لاپەڕە (٤)ی کتێبی « مختصر
صرفو نحوی کوردی »دا(٢٤) نووسراوە : « دەبێ بزانین
ئەو حەرفە هیجایانەی کە لە کوردیدا لە عەمەل دێنرێنو
کەلیمەیان لێ دروست دەبێ چەندنو چین ؟ . ئەو حەرفانە
(٢٨) حەرفی هیجای عەرەبی و (٨) حەرفی ترن کە غەیرە
عەرەبینو ئەمانەن : ( پ ، چ ، ژ ، ڤ ، گ ، ڵ ، و ، ی)(٢٥)
کەوابوو حەرفانی هیجای کوردی (٣٦) حەرفن »(٢٦) ...
ئەو هەشت حەرفانەی کە عەرەبی نین شکڵێکی جوێیان نییە ،
ئەمما بەعضێکیان بە نوقطە زیادو بەعضێکیان یا بە تێ‌فکرینێکی
کەمو یا بە دانانی (٧) لەسەریان جوێ دەکرێنەوە . ئەوانەی
کە بە نوقطەی زیاد جوێ دەکرێنەوە حەرفانی (پ ، چ، ژ ،
ڤ، ڵ ) کە بەسێ نوقطە لە ( ب ، ج ، ز ، ف ، ل ) و ئەوانەی
کە بە تێ‌فکرینێکی کەم یا بە ئیشارەتی (٧) جوێ دەکرێنەوە
( و ) ی کراوە ، ( ی ) ی خوارە لە ( و ) ی گوشراو و
( ی ) ی ڕاست جوێ دەکرێتەوە »(٢٧)

**ئەگەرچی لەو هەشت پیتە ناعەرەبییەی مامۆستا سەعید صدقی لێیان دواوە (پ ، چ ، ژ ، ڤ ، گ) زۆر بەر لەو بەکارهێنراون . لامی قەڵەویش لە ساڵی ١٩١٩دا نیشانەی بۆ دانراوە . بەو پێیە دەمێنێتەوە ( ێ ) و ( ۆ ) . هەرچی ئەو دوو پیتەیە ، ڕەنگە زانایانی ساڵانی بیست لە نێو خۆیاندا قسەیان لێوە کردبێ ، بەڵام ئەمە ڕێگە لەو ڕاستییە ناگرێ ، کە بە نووسینو لەسەر لاپەڕەی کتێب بۆ یەکەم جار لە لایەن مامۆستا سەعید صدقییەوە باسکراوەو نیشان دراوە ... کەچی مامۆستا نەریمان نەك هەر باسی نەکردووە ، بەڵکو ناویشی نەبردوە .**

لە کتێبی « ڕێنووسی کوردی لە ڕەگو ڕیشەوە » دا
باسی ئەو بایەخە تایبەتیەی چارەسەرکردنی ڕێنووسی
کوردی نەکراوە ، کە لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا (کۆمەڵەی
گشتی کردنی خوێندەواریو چاککردنی ڕێنووس ) و
( کۆمەڵەی هیڤی ) داویانە . ئەو بەرهەمەی لەم بارەیەوە
هێنابوویانە ئەنجام ، ئەلفوبێیەك بوو لەسەر بناغەی پیتەکانی
عەرەبیو هەشت پیتی نوێیان بۆ زیادکردبوو . پیتەکانی ئەم
ڕێنووسە بە یەکەوە نەدەلکان . پیتە نوێ پێشنیارکراوەکانیش
سەرو بۆرو ژێرو ئەلفو واوی کراوەو واوی درێژو یێی لارو
دیفتۆنگی ( وێ ) بوون ، کە نیگارەکانیان شێوەیەکی تایبەتییان
هەبوو وەك ئەوانە نەبوون ، کە لە نووسینی ئەمڕۆی کوردیدا
هەن . جا هۆ هەرچییەك بووبێ ئەم ڕێنووسە پەرەی نەسەند .

دەربارەی کێشەی نووسینی کوردیو ڕێگەی
چارەسەرکردنیو پێویستی گرنگی پێدانیو خستنە پێش‌چاوی
ئەو ئەلفوبێ نوێیە لە ژمارە (٣)ی گۆڤاری « ڕۆژی کورد » دا
بە زمانی تورکی وتارێك بەناوی « پیتەکانمانو ئاسانکردنی
خوێندنەوە » هوە بڵاوکراوەتەوە(٢٨) . بەدوا ئەو وتارەشدا
نامەیەك چاپکراوە ، کە کۆمەڵەی گشتی کردنی خوێندەوارییو
ڕێنووس بۆ گۆڤاری « ڕۆژی کورد » یان ناردووە(٢٩) .

**لە کتێبی ناوبراوی مامۆستا نەریماندا ئەو هەوڵە گرنگانەش بەرچاو ناکەون ، کە لە خوارەوە پەنجەیان بۆ ڕادەکێشین :**

١ ـ ئەوەی لە بەشێکی زۆری ژمارەکانی گۆڤاری «دیاری
کوردستان » ( ١٩٢٥ ـ ١٩٢٦ ) دا سەبارەت بە گیروگرفتی
نەبوونی وێنەی هەندێ دەنگی کوردی لە ئەلفوبێی عەرەبیداو
هەوڵی چارەسەرکردنیو هەروەها بیرورا لە بارەی نووسینی
کوردییەوە بە لاتینی ، ژمارەیەك ، وتار بڵاوکراوەتەوە ، کە
وتاری مامۆستایان : تۆفیق وەهبی(٣٠) ، حەقی شاوەیس(٣١)،
پیرۆت)(٣٢) ، حەسەن

کوردستانی(٣٣)... لەنێوانیاندا دیارن

٢ ـ لە ژمارەکانی ساڵی (١)ی گۆڤاری ( هیوا )دا کۆمەڵێك
وتار سەبارەت بە ڕێنووسی کوردی دەبینرێ . بە وێنە
مامۆستا (ب.) بەناوی « چۆن زمانەکەمان بنووسین » هوە
زنجیرەیەك وتاری نووسیوە(٣٤)و دەربارەی جۆری لێکۆڵینەوەی
ڕێنووسی کوردی تیایاندا دواوەو باسی ئەو مەرجانەی کردووە
کە دەبێ لە چاکترین ئەلفوبێدا هەبن . دوای لێکۆڵینەوە لە
نووسین بە پیتی عەرەبیو لاتینی ، بە بەڵگەی ڕاستو زانستی
ئەوەی نیشانداوە کە ئەلفوبێی لاتینی لەگەڵ زمانی کوردیدا پتر
دەگونجێ .. مامۆستا (ب.) لە ژمارە (٩)یشدا ، بەناوی
« فرمانی ئێستەمان » هوە وتارێکی بڵاوکردۆتەوە(٣٥) و باسی
پەیدابوونی چوکلەو پیتو دارشتنیانی تێدا کردووەو ئەو
قۆرتانەشی نیشانداوە کە لە ڕێنووسی کوردیدا هەنو لە
بارەی ئەو فرمانانەشەوە دواوە کە سەر شانی خوێندەوارانن..
مامۆستا فوئاد زەکی هەناری لە ژمارە (٧)دا باسی ئەو ( د )ە
دەکا کە لە ناوچەی سلێمانی کلۆردەکرێو نیشانی دەدا کە ئەمە

ـێ لە زمانی ئەدەبیدا ڕەنگ بداتەوە(٢٦). لە ژمارە (٨)دا مامۆستا م.م. دەربارەی وێنەی هەندێ دەنگ و نووسینی هەندێ وشە چەند پێشنیارێکی کردووە(٢٧) . لە ژمارە (١٠)دا مامۆستا جەمیل ڕۆژبەیانی موناقەشەی ڕای نووسین بە عەرەبی و لاتینی دەکاو لەو دەنگانە دەدوێ کە نیگاریان نەوێ(٢٨) .

٣ ـ لە گۆڤاری « ڕۆژی نوێ » شدا هەندێ وتار بڵاوکراوەتەوە . بۆ نموونە : لە ژمارە ( ٦ ، ٨ ، ١١ ) ی ساڵی (١) دا مامۆستا مارف خەزنەدار زنجیرەیەك وتاری بڵاوکردۆتەوە(٢٩) و سەبارەت بە نووسینی هەندێ پیت و وشەو ئەمراز دواوە ، مامۆستا عەلائەدین سەجادی لە ژمارە ( ١٢ )ی ساڵی (١)دا باسی دانانی نیشانەکانی پیتی کوردی کردووە(٤٠). لە هەمان ژمارەدا مامۆستا جەمیل ڕۆژبەیانی بە ناوی « ڕاستکردنەوە » وە وتارێکی نووسیوە(٤١)و بیروڕای خۆی بەرانبەر هەندێ نووسین ، بەتایبەتی وتاری ناوبراوی مامۆستا خەزنەدار ، تێدا دەربڕیوە . لە ژمارە ( ٣ )ی ساڵی ( ٢ )دا مامۆستا طاهر صادق ڕای سەبارەت بە نووسینی وشەی داڕێژراوو لێکدراوو وشەی کۆتایی هاتوو بە ( ی ) لە دۆخی ئیزافەداو واوی پێوەندی .. نیشان داوە(٤٢) . لە ژمارە (٦)ی هەمان ساڵیشدا مامۆستا شێخ حەسەن بەناوی«(ی)ی ئیزافەو (واو)ی عەتف »ەوە وتارێکی بڵاوکردۆتەوە(٤٣) .

٤ ـ نامیلکەی « بەرگی ئیملای کوردی »ی مامۆستا مەعرووف جیاوك(٤٤) و نامیلکەی « دەستووری نووسینی زمانی کوردی بە پیتی عەرەبی »ی مامۆستا ا.ب هەوری(٤٥) .

٥ ـ ئەو وتارە دیارانەی لە گۆڤارو ڕۆژنامە کوردییەکانی نێوان ساڵانی ٧٠ ـ ٨٠دا لەبارەی ڕێنووسی کوردییەوە بڵاوکراونەتەوە. بەوێنە : «گیروگرفتی ڕێنووسی کوردی»(٤٦)، « ڕێنووسی کوڕ »(٤٧) ، « چەند سەرنجێکی زمانەوانی »(٤٨)، « جارێکی تریش پیتەکانی کوردی »(٤٩) ، « ڕێنووس پەیڕەوی زمانناسی بکا باشە »(٥٠) ، « دواوانێك بۆ ڕێنووسی کوردی »(٥١) ، « ڕێنووسی کوردی و چەند هەڵوێستێك»(٥٢) .. هتد ..و گەلێکیتر .

مامۆستا نەریمان نەك هەر باس لەو نامیلکەو کتێبانە دەربارەی نووسینی کوردی بە ئەلفوبێی لاتینی بڵاوکراونەتەوە، نەدواوە ، بەڵکو تەنانەت ژمارەیەك کە دیارو بەنرخیش هەن ، ناویشی نەبردوون ، بە وێنە :

١ ـ ساڵی ١٩٢٠ محەمەد زەکی ئەفەندی و میرزا محەمەد باشقە کە مامۆستایانی قوتابخانەی حکومەتی سلێمانی بوون و بە هاریکاری ی.ب. سۆن و ج. فاریلل بە ناوی « قەرائەتی کوردی » یەوە نامیلکەیەکی ( ٣٤ ) لاپەڕەییان بڵاوکردەوە(٥٣) . لەم نامیلکەیەدا باسی ئەلفوبێی کوردیان کردووەو لە بارەی نووسینی کوردی بە لاتینی دواون .

٢ ـ ساڵی ١٩٥٧ مامۆستا جەمال نەبەز بەناوی «نووسینی کوردی بەلاتینی » یەوە نامیلکەیەکی بڵاوکردەوە(٥٤) ، کە پێوەندی بە ڕێنووسی کوردییەوە هەیەو بە شێوەیەکی زانستی لە چۆنیەتی نووسینی کوردی بە لاتینی دواوە .

٣ ـ چەند نامیلکەیەکی جەلادەت عالی بەدرخان ، وەك : « ڕێزانا ئەلفابێیا کوردی »(٥٥) ، « ڕووبەلنەن ئەلفابێ »(٥٦) .. و عوسمان صەبری ، وەك : « ئەلفابێیا کوردی »(٥٧) .. و هەندێکیتر .

بەمەدا وا دەردەکەوێ ، کە مامۆستا نەریمان ئاگاداری زۆربەی ئەو سەرچاوانە نییە کە لە مەسەلەی مێژووی ڕێنووسی کوردیدا دەوری گرنگیان بینیوە .. ئەوەی پتریش جێی سەرنجێ ئەوەیە ، تەنانەت **لەو نووسینانەش کە باسی** کردوون باش وردنەبووەتەوەو کاتێ **لەبارەیانەوە دەدوێ چەندین** هەڵەی کردووە ، بۆ نموونە :

**١ ـ لەباسی ئەو وێنانەدا کە مامۆستا توفیق وەهبی بۆ دەنگە بزوێنەکان وکۆنسۆنانتەکانی داناوە :**

أ ـ مامۆستا نەریمان وای نیشانداوە ، کە مامۆستا وەهبی بۆ کێشانی وێنەی دەنگی ( ۆ ـ O ) ، حەوتێکی لەسەر پیتی واو داناوە .. تەماشاکردنێکی سەرپێیی کتێبی « دەستووری زمانی کوردی » ئەوە دەردەخا کە مامۆستا وەهبی نەك هەر بۆ ئەو جۆرە واوە ، بەڵکو بۆ هیچ چەشنە واوێك حەوتی بەکارنەهێناوە . هەرچی نیگاری واوی کراوەشە لای مامۆستا وەهبی بە ( واوێکی کەشیدە لەسەر ) دەنووسرێ.

ب ـ مامۆستا وەهبی دوو واوی کردۆتە وێنەی دەنگی بزوێنی ( وو ـ ۊ )ی درێژ ، کەچی مامۆستا نەریمان دەڵێ ، ( واو کەشیدەیەك لەسەری ) کردۆتە نیگاری ئەو دەنگە .

ج ـ مامۆستا نەریمان نەباسی ئەوەی کردووە ، کە مامۆستا وەهبی دوو ( ی )ی بۆ دەنگی بزوێنی (ی)ی تیژ پەسەندکردووەو نە لەوە دواوە کە بۆ نیشاندانی دەنگی ( ڵ ) خاڵێکی لەسەر (ل) داناوە .

د ـ نووسەری کتێبی « ڕێنووسی کوردی لە ڕەگ و ڕیشەوە » کاتێ دەربارەی جیاکردنەوەی ( ر ) و ( ڕ ) دەدوێ لە کتێبی « دەستووری زمانی کوردی »دا ، هەڵەیەکی گەورەی

کردووه که به ( ڕ ) ی قەڵەوی وتووه : « ( ر )ی گیرەدار ( مشدد ) » ( ل ٢٠ ) .

### ٢ ــ لە باسی نیگارە نوێکانی ڕێنووسی مامۆستا مەلا ڕەشید بەگی باباندا .

أ ــ مامۆستا نەریمان نووسیوێتی ، کە مامۆستا مەلا ڕەشید « لە ژێر ( ڕێی قەڵەو ) نیشانەیەکی داناوە » (ل١٩). وێڕای ئەوەی نووسەر دیاری‌نەکردووە کە ئەو نیشانەیە چی‌یەـ چوکلەیەیان خاڵە .. هەروەها واڤیمەکەشی بە هەڵەوگێڕاوی خستۆتە پێش چاو . ڕاستی‌یەکەی ئەوەیە کە نیشانەکە خاڵەو خاڵەکەش بۆ دەنگی ( ر )ی لاوازە نەك قەڵەو .

ب ــ مامۆستا نەریمان بە هیچ جۆرێك ناوی ئەوەی نەبردووە ، کە مامۆستا مەلا ڕەشید بۆ (ی) درێژ کەشیدەیەکی لە ژێر (ی)دا داناوە ..

### ٣ ــ لەباسی کتێبی « زمانی یەکگرتووی کوردی »ی د. نەبەزدا .

د. جەمال نەبەز کاتێ باسی گیروگرفتەکانی نووسینی کوردی بە ئەلفوبێی عەرەبی دەکات ، زۆر ڕاست بۆ ئەوە چووە کە ئەو ئەلفوبێ‌یە : « هەرچی چۆنێك دەسکاری بکرێ ، هێشتا گەلێك ناتەواوی تێدا دەمێنێ »(٥٨) . یەکێکیش لە نموونەی ناتەواوییەکانی کە پەنجەی بۆ ڕاکێشاوە ، ئەوەیە کە : «تیپی دەنگداری وون‌بوو ( واتا ژێری کورت یا بزرۆکە ــ تۆفیق وەهبی وتەنی ــ بەم ئەلفوبێ‌یە نانووسرێ »(٥٩) .. کەچی مامۆستا نەریمان وانیشان دەدات کە گوایا د. نەبەز « داوا ئەکات ، ئەڵێت : لە نووسینی کوردیدا نابێت ( ژێری گوشراوـ کمرة مختلفة ) بنووسرێت چونکە بریتی‌یە لە دەنگێکی زۆر کورت » (ل ٥ ) . ئەگەر مامۆستا نەریمان باش نووسینەکەی د. نەبەزی بخوێندایەتەوە ، تووشی ئەو هەڵەیە نەدەبووو ڕای ڕاستەو دروستی نووسەری کتێبی « زمانی یەکگرتووی نەدەشێواند .. یەکێك کە نەبوون‌و چارەسەرنەکردنی وێنەی کورتە بزوێنی ( أ ) لە ئەلفوبێی عەرەبیدا بە گیروگرفت دابنێ، ئیتر چۆن نووسینی بە پێویست نازانێ ؟

### ٤ ــ باسی چوکلەی ( ر )ی قەڵەو.

مامۆستا نەریمان کاتێ لە پەیدابوونی نیگاری ( ر ــ چوکلەیەك لەسەری ) دەدوێ ، دەڵێ : « ( قادری فەتتاحی قاضی ) یەکەم کەس بووە کە حەوتی لەژێر (ڕێی گیرەدار )ەوە لە خوارەوە بردوەتە سەرەوەی‌و چەند کتێبێکی خۆی بەم چەشنە چاپ‌کردووە » ( ل ٣٤ ) .. بەر لە هەرشت ئەگەر تەماشای مێژووی پەیدابوونی پیتی ( ر )ی قەڵەو بکەین ، دەبینین لە پێشدا چوکلەی لەسەرەوە بۆ دانراوەو دوایی هێنراوەتە خوارەوە(٦٠) ، نەك مامۆستا نەریمان وتەنی کە بە پێچەوانەوە دەڵێ : « ... لە خوارەوە بردۆتە سەرێ » ... هەرچی یەکەم کەسیشە ، کە کتێبی بەو جۆرە چاپ‌کردووە قادری فەتتاحی قازی نییەو مامۆستا عەلائەدین سەجادی‌یە. مامۆستا سەجادی ساڵی ١٩٥٣ لە کتێبی « ناوی کوردی » دا ئەو پیتەی بەکارهێناوەو قادری فەتتاحی قازی سیازدە ساڵ دوای ئەو بەکاری هێناوە .

### ٥ ــ باسی نووسینی واوی پێوەندی .

مامۆستا نەریمان بەجیا نووسینی واوی پێوەندی بەکاری کۆڕی زانیاری کورد داناوە ، بەڵام ئەگەر تەماشای ژمارە (٦)ی ساڵی ( ٢ )ی گۆڤاری « ڕۆژی نوێ »ی بکردایە ، ئەوە بۆی دەردەکەوت کە مامۆستا شێخ حەسەن دوازدە ساڵ بەر لە کۆڕی زانیاری بە بەڵگەی ڕاستەو زانستی‌یەوە ئەوەی تۆمارکردووە(٦١) ... هەندێکی تر .

وێڕای ئەو هەموو هەڵەو نادروستی‌و ناتەواوی‌و کەم‌و کورتیانەی لێیان دوام ، هەروەها لەگەڵێ شوێندا سادەو ساکاری دەبینرێ . بە وێنە :

کاتێ باسی هەر جۆرە نووسینێك دەکات بەزۆری هەر نیشاندانێکی سەرپێیی بێ‌بەڵگەو بێ‌نموونەیە . خۆ ئەگەر ناو بەناو یەکێکیانی هەڵسەنگاندبێ ، ئەوە بە دوو سێ دێڕی ساکار بڕیویەتی‌یەوە .. ئەوەی لە ڕووی سادەو ساکاریی کتێبی « ڕێنووسی کوردی لە ڕەگەو ڕیشەوە » تەواو جێی ڕەخنەبێ ، ئەوەیە کاتێ لە کۆتاییدا ( ل ٥٥ ــ ٥٦ ) باسی گیروگرفتەکانی ڕێنووسی کوردی دەکات هەشت خاڵی ئێجگار سەرپێیی دیاری کردووە .. ئەوەی کەمێ ئاگاداری ڕێنووسی کوردی‌بێت ، دەزانێ کۆسپ‌و گیروگرفت هێندە زۆرن ، کە بیرو قەڵەم‌و دەست ماندوو دەکەن .

من بەش بەحاڵی خۆم گلەیی زۆرم لەو جۆرە سادەو ساکاری‌یانەی نووسەر نییە ، بەڵام نەك هەر گلەیی ، بەڵکو لۆمەشی دەکەم ، کە لە هەندێ باسدا حوکمی هەڵەو چەوت دەدات ... بەوێنە ، کاتێ باسی ئەلفوبێی لاتینی دەکات لای تورکەکان ، دەڵێ کە مستەفا کەمال « مەبەستی لەم هەنگاوە پشت هەڵکردن بوو لە پیتی عەرەبی‌و ئاینی ئیسلام‌و خۆ

تریك كردنەوەبوو لە ئەورووپاوە . وە بە زۆری كوتەك پیتی لاتینی سەپاندە سەر دانیشتوانی توركیا » ( ل ٢١ ) ..

ماموستا نەریمان وێڕای ئەوەی ویستویەتی بەكارهێنانی ئەلفوبێی لاتینی لەڕێی لە خواترسی‌یەوە لەپێش چاوی خەڵك خات ، هەروەها هەوڵی‌داوە نابەدڵی چەند كەسێكیشی بۆ كاتە بەڵگەی خراپی‌و نالەباری‌و بڵێ : « لەم دواییەدا چەند توركێكی ئەو وڵاتەم بینی دڵیان بۆ پیتی ( عەرەبی ) لێ‌ئەداو لاتینیان بەدڵ نەبوو چاریشیان ناچار بوو ، لە دەم كاربەدەستێكی كوردم بیست كە وەزیرێكی تورك تا ئێستاش نامەی شتی خۆی بە پیتی عەرەبی ئەنووسێت‌و بە تەواوەتی

نەیویستوە فێرە لاتینی بێت » ( پەراوێزی ژ ٣ ، ل ٦١–٦٢ ) ..بەڵێ ئەم باسە لێكۆڵینەوەی قووڵ‌و دوورو درێژی دەوێ‌و ئێرەدا جێی نابێتەوە .. جا بەداخەوە هەر ئەوەندەم پێ دەوترێ ، كەبڵێم نە زانست‌و نە ڕاستی لەگەڵ ئەم حوكمەی ماموستا نەریماندا نین ..

ئەو هەموو هەڵەو چەوتی‌یە ، ئەو هەموو ناتەواوی‌و كەم‌و كورتی‌یە ، ئەوهەموو سادەو ساكاری‌یەی باسم‌كردن ، تەنیا بەشێكن لەوەی توانیومە دەریان برم ... بەردەوامی‌ی ئەم لێدوانە ئاو زۆر دەكێشێ‌و ناچار كۆتایی پێ‌دێنم .. بەڵام بەر لە كۆتایی سەرنجێكی گرنگ لە بارەی ناوو ناوەڕوكی كتێبەكەوە هەیە ، بە پێویستی دەزانم ، بیخەمە پێش چاو :

كتێبێك كە ناوێكی فراوانی وەك : « ڕێنووسی كوردی لە ڕەگ‌و ڕیشەوە»ی هەبێ پێویستبوو لەو جۆرە نووسینەوە دەست‌پێ‌بكات ، كە كورد لە سەرەتای پەیدابوونی‌یەوە بەكاری هێناوەو دوایی لە وەرگرتنی ئاینی ئیسلام‌و ئەلفوبێی عەرەبی‌یەوەو ئنجا بەكارهێنانی لاتینی‌و سلاڤی‌و ئەرمەنی ..

وەك دەزانین لە بارەی نووسینی كوردیەوە بەر لە ئیسلام زانست شتێكی ئەوتۆی لێ ئاشكرانییەو ماموستا نەریمانیش بە هیچ جۆرێك خۆی لەو دەورە نەگەیاندووە .. لە سەرەتای پەیدابوونی ئیسلامیشەوە تا ئەم دوو سێ سەدەیەی دوایی لە قسەی ڕووت بەولاوە هیچ بەڵگەیەكی ماددی نییەو نووسەری كتێبی « ڕێنووسی كوردی لەڕەگ‌و ڕیشەوە»یش جگە لە یەك دوو قسەی سەرپێیی ، بەڵگەی نووسراوی تێكستەكانی مەلا مەحموودی بایەزیدین ، كە تەمەنیان ١٥٠ ساڵێك دەبێ ... جگە لە ئەلفوبێی عەرەبی‌و لاتینی كورد هەندێ ئەلفوبێی تری وەك سلاڤی‌و ئەرمەنیشی بەكارهێناوەو ماموستا نەریمان هەر ناویشی نەبردوون ... هەرچی ئەو كارانەشە كە بە ئەلفوبێی عەرەبی‌و لاتینین بەشێكی زۆریانی یادداشت نەكردووە جا ئیتر ئەو ناوە گەورەو فراوانە چۆن لەگەڵ ئەو ناوەڕۆكە

كەم‌و كورتەدا ڕێك دەكەوێ ؟

## پەراوێزەكان

١ – مستەفا نەریمان ، ڕێنووسی كوردی لە ڕەگ‌و ڕیشەوە، بەغدا ، ١٩٨١ .

٢ – ضیاءالدین باشا الخالدی المقدسی ، الهدیة الحمیدیة فی اللغة الكردیة ، ١٣١٠ هـ .

(3) O. Fossum, A practical Kurdish grammar, Minnea-

٤ – بۆ زانستی زیاتر لەم بارەوە ، بڕوانە :

ا – د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف ، كورتەیەكی مێژووی نووسینی كوردی بە ئەلفوبێی عەرەبی ، « گۆڤاری كۆڕی زانیاری عێراق – دەستەی كورد » ، ب ٢٨ بەغدا ، ١٩٨١ ، ل ٧٠ .

ب – مەلا محەمەدی سیوچی ، تذكرة العوام یان بەیتی ئەووەڵ‌و ئاخر ( لێكۆڵینەوەی : محەمەد عەلی قەرەداغی ، سلێمانی ، ١٩٧٩ ، ل ٩–١٢).

٥ – م. ب. ڕودێنكۆ ، « عادات‌و رسومات نامەی اكرادیە»ی مەلا مەحموودی بایەزیدی ، مۆسكۆ ، ١٩٦٦ .

٦ – «كوردستان» یەكەمین ڕۆژنامەی كوردی ١٨٩٨–١٩٠٢، كۆكردنەوەو پێشەكی : د. كەمال فوئاد ، بەغدا، ١٩٧٢.

٧ – س = ستوون .

٨ – «تێگەیشتنی ڕاستی » ، بەغدا ، ١٩١٨ – ١٩١٩ ، ( بۆ وەرگرتنی زانیاری تەواو لە بارەی ئەو ڕۆژنامەیەوە ، بڕوانە: د. كەمال مەزهەر ، تێگەیشتنی ڕاستی‌و شوێنی لە ڕۆژنامەنووسی كوردیدا ، بەغدا ، ١٩٧٨ .

٩ – بە هیچ چەشنێك دەستكاری ڕێنووس‌و هەڵەی چاپ‌و شێوازی ئەم نموونەیەو هەندێ نموونەی ترم نەكردووە، كە لە ( تێگەیشتنی ڕاستی ) یان چاپەمەنی‌یەكی دی كۆندا هێناومنەتەوە .

١٠– « تێگەیشتنی ڕاستی » ، ژ ٦٣ ، ١٣ی كانوونی دووەمی ١٩١٩ ، ل١ .

١١– شایانی باسە، د. كەمال مەزهەر دەربارەی ئەو هەنگاوەی « تێگەیشتنی ڕاستی » دواوەو لێی كۆڵیوەتەوە ، بڕوانە : سەرچاوەی ناوبراو ، تێگەیشتنی ڕاستی‌و شوێنی لە ڕۆژنامەنووسی كوردیدا ، ل ١٥١ – ١٥٢ .

١٢– گۆڤاری « ژین »ی ئەستەمووڵ ، ژ ١٨ ، ٨ی مایسی

١٣٣٥ ــ ٨ى مايسى ١٩١٩ . ( ئەو ئـــەلفوبێیە لـــە ژمارەکانى دواتریشدا . بلاوکراوەتەوە . بەدوا ژمـــارە ١٨دا من تەنیا ژمارە ١٩ و ٢١ م بینیوەو لە هەردووکیاندا هەیە .

١٤ــ گۆڤارى « زارى کرمـــانجى » ، ژ ٧ ، ڕەواندز ، ٣ى کانوونى دووەم ، ١٩٢٧ ، ل ٢٨ .

١٥ــ تۆفیق وەهبى ، دەستوورى زمانى کوردى ، جــزمى یەکەم ، بەغدا ، ١٩٢٩ .

١٦ــ ئەو داوەر ئەردەڵانى‌یەى لە ژمارە (١٨)ى گۆڤـــارى «ژین»دا ، کە ڕێکەوتى ٨ى مایسى ١٣٣٥ دەکات، لـــە ژمارە (٧)ى گۆڤارى « کوردستان » یشدا ، کە هـــەر دیسان لە (٨)ى مایسى ١٣٣٥ دا دەرچووە ، وتـــارێکى بەناوى « هێشتا نووستوین » ەوە بلاوکردۆتەوەو لێرەشدا هەروەها پیتى ( ئـ )ى بەکارهێناوە .

١٧ــ نشریات هیوى جوانا طلبە کوردان ، هینکر زیمـــــان کوردى ، چاپخانەى نجم استقبال ، بـــاب عالى ، ابـــو السعود ، ١٩٢١ .

١٨ــ عەبدولڕەحمان سەعید : کۆمەڵە شیعرى حاجى قـادرى کۆیى ، بەغدا ، ١٩٢٥ .

١٩ــ لاوانى کورد ، ڕەووشت و خوو ، بەغدا ، ١٩٢٧ .

٢٠ــ حـــسەین حوزنى موکریانى ، پێشواى ئایین ، ڕەواندز ، ١٩٢٧ .

٢١ــ سەرچاوەى ناوبراو ، عەبدولڕەحمان سەعید ، کۆمەڵە شیعرى حاجى قادرى کۆیى .

٢٢ــ قانوونى هەڵبژاردن ، بەغدا ، ١٩٢٥ .

٢٣ــ سەرچاوەى ناوبراو ، لاوانى کورد ، ڕەووشت و خوو .

٢٤ــ سەعید صدقى ، مختصر صرف و نحوى کوردى ، بەغدا، ١٩٢٨ .

٢٥ــ هەرچەندە لێرەدا نووسەر چوکلەى لەسەر ( ۆ ) و (ێ) دانەناوە ، بەڵام دوو دێڕ خوارتر کە تێکڕاى پیتەکـــانى ڕیزکردووە ، نەک چوکلە ، بەڵکو ژمارەى (٧)ى لەســـەر ( ۆ ) و ( ێ ) داناوە . بێ‌گومان ئەمەش هۆى نەبوونى ئەو نیشانانە بوون لە چاپخانە ، هەر بۆیەش لە ســـەرپاکى کتێبەکەدا نەسێ خاڵى سەر ( ل ) و نە چوکلەى سەر ( و ) و ( ى ) نابینرێ .

٢٦ــ سەرچاوەى ناوبراو ، سەعید صدقى ، مختصر صرف و نحوى کوردى ، ل ٣ .

٢٧ــ هەمان سەرچاوە ، ل ٤ .

٢٨ــ م . ص . ئازیزى ، حروفمزو تسهیل قرائت ، گۆڤارى ڕۆژى کورد ، ژ ٢ ، ئەستەموول ، ٦ى تەمووزى ١٣٢٩ك ١٩١٣ ز ، ل ١٢ ــ ١٣ .

٢٩ــ ( تعمیم معارف و اصلاح حروف ) جمعیت محترمەســى طرفندن وارد اولمشدر : روژکرد مجموعەسى مدیریت علیە سنە ، گۆڤارى « ڕۆژى کورد » ، ژ٢ ، ئەستەموول، ٦ ى تەمووزى ١٣٢٩ ك ، ١٩١٣ز ، ل ١٣ ــ ١٦ .

٣٠ــ تۆفیق وەهبى ، کوردییەکەمان بە چۆن حرووفێکو چۆن بنووسین ، گۆڤارى « دیارى کوردستان » ، بەشـــى یەکەم ، ژ ٥ ، بەغدا ، ١٢ مایسى ١٩٢٥ ، ل ٥ ــ ٦ ، بەشى دووەم ، ژ ٦ ، بەغدا ، ٢٩ مایسى ١٩٢٥ ،ل٥ــ٦ .

٣١ــ ا ــ حەقى شاوەیس ، نووسینى کوردى چۆن بێ ؟، گۆڤارى « دیارى کوردستان » ، بەشى یەکەم ، ژ ٥ ، بەغدا ، ١٢ مایسى ١٩٢٥ ، ل ٨ــ٩ ، بەشى دووەم ، ژ٦ ، بەغدا ، ٢٩ مایسى ١٩٢٥ ، ل ٧ــ٨ .

ب ــ حەقى شاوەیس ، ئیملاى کوردى ــ حـــروفاتى عەرەبى ، گۆڤارى « دیارى کوردستان » ، بەشى یەکەم، ژ٧،بەغدا، ١٤ تەمووزى ١٩٢٥ ، ل ٧ ــ ٩ ، بەشى دووەم ، ژ ١٠ ، بەغدا ، ٢١ تشرینى یەکەمى ١٩٢٥ ، ل ٩ ــ ١٢ .

ج ــ حەقى شاوەیس ، لاپەڕەى نووسینى تازەو کوردى یەتى : لە نووسینو شێوەدا سەربەخۆ ، بەغدا ، گۆڤارى « دیارى کوردستان » ، بەشى یەکـەم ، ژ ١٣ ــ ١٤ ، بەغدا ، ٥ مارتى ١٩٢٦، ل ١٨ــ٢٠، بەشى دووەم ، ژ ١٥ ، بەغدا ، ١٨ مارتى ، ١٩٢٦ ، ل ١٠ ــ ١٢ .

٣٢ــ پیرۆت ، کوردى بە چێ حەرفێ بنووسرێ ، گۆڤـــارى « دیارى کوردستان » ، ژ١١ــ١٢، بەغدا ، ٥ کانوونى یەکەمى ١٩٢٥ ، ل ٩ ــ ١١ .

٣٣ــ حەسەن کوردستانى ، لەحەق نووسین تازە ، گۆڤارى « دیارى کوردستان » ، ژ ١٦ ، بەغدا ، ١١ مایسى١٩٢٦، ل ٨ ــ ١٠ .

٣٤ــ ب. چۆن زمانەکەمان بنووسین ، گۆڤـــارى « هیوا » ، بەشى یەکەم،ژ ٤ ، ساڵى ١، بەغدا ، ١٩٥٧ ،ل.١٠ــ١٧، بەشى دووەم ، ژ ٦ ، ساڵى ١ ، بەغـــــدا ، ١٩٥٧ ، ل ٨ ــ ١٩ .

٣٥ــ ب. فرمانى ئێستەمان ، گۆڤـــارى « هیوا » ، ژ ٩ ،

سالی ۱ ، بەغدا ، ۱۹۵۸ ، ل ۷ ــ ۱۸ .

٣٦ــ فوئاد زەکی هەناری ، نووسینی تیپی ( دال ) بە شێوەی سلێمانی ، گۆڤاری « هیوا » ، ژ ۷ ، سالی ۱ ، بەغدا ، ۱۹۵۸ ، ل ۱۹ ــ ۲۱ .

٣٧ــ م. م. ( محەمەدی مەلا کەریم ) ، نووسینی زمانی کوردی ، گۆڤاری « هیوا » ، ژ ۸ ، سالی ۱ ، بەغدا ، ۱۹۵۸ ، ل ۹ ــ ۱٤ .

٣٨ــ جەمیل بەندی رۆژبەیانی ، چۆن زمانەکەمان بنووسین ، گۆڤاری « هیوا » ، ژ ۱۰ ، سالی ۱ ، بەغدا ، ۱۹۵۸ ، ل ۸ ــ ۱۱ ، ۸۹ ــ ۹٤ .

٣٩ــ مارف خەزنەدار ، زمانەوانی ، گۆڤاری « رۆژی نوێ » ، بەشی یەکەم ، ژ ٦ ، سالی ۱ ، سلێمانی ، ۱۹٦۰ ، ل ۲۳ ــ ۲٦ ، بەشی دووەم ، ژ ۸ ، سالی ۱ ، سلێمانی ، ۱۹٦۰ ، ل ۱۳ ــ ۱۸ ، بەشی سێیەم ، ژ ۱۱ ، سالی ۱ ، سلێمانی ، ۱۹٦۰ ، ل ۳۸ ــ ٤۵ .

٤٠ــ عەلائەدین سەجادی ، دانانی نیشانەکانی پیتی کوردی ، گۆڤاری « رۆژی نوێ » ، ژ ۱۲ ، سالی ۱ ، سلێمانی ، ۱۹٦۰ ، ل ۱۱ ــ ۱۸ .

٤١ــ جەمیل بەندی رۆژبەیانی ، راستکردنەوە ، گۆڤاری « رۆژی نوێ » ، ژ ۱۲ ، سالی ۱ ، سلێمانی ، ۱۹٦۰ ، ۵۹ ــ ٦٤ .

٤٢ــ طاهیر صادق ، هەڵەی نووسین ، گۆڤاری « رۆژی نوێ » ، ژ۳ ، سالی ۲ ، سلێمانی ۱۹٦۱ ، ل ٦۵ــ٦۷ .

٤٣ــ شێخ حەسەن ، (ی)ی ئیزافەو (واو)ی عەتف ، گۆڤاری « رۆژی نوێ » ، ژ ٦ ، سالی ۲ ، سلێمانی ، ۱۹٦۱ ، ل ۱۵ ــ ٦۷ .

٤٤ــ مەعرووف جیاوك ، بەرگی ئیملای کوردی ، بەغدا ، ۱۹۳۰ .

٤۵ــ ا.ب. هەوری ، دەستووری نووسینی زمانی کوردی بە پیتی عەرەبی ، سلێمانی ، ۱۹٦۸ .

٤٦ــ مەسعوود محەمەد ، گیروگرفتی رێنووسی کوردی ، گۆڤاری « پەروەردەو زانست » ، ژ٦ ، بەغدا ، ۱۹۷۳ ، ل ۷ ــ ۲۸ .

٤۷ــ مەسعوود محەمەد ، رێنووسی کوڕ . « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » ، ب٤ ، بەغدا ، ۱۹۷٦ ، ل ۲۳۲ــ۲۸۸ .

٤۸ــ د. کەمال فوئاد ، چەند سەرنجێکی زمانەوانی ، گۆڤاری « رۆژی کوردستان » ، ژ ۲ ، بەغدا ، ۱۹۷۱ ، ل۵۸ــ۵۹ .

٤۹ــ محەمەد صالح سەعید ، جارێکی تریش پیتەکانی کوردی ، گۆڤاری . « نووسەری کورد » ، ژ٤ ، بەغدا ، ۱۹۷ ، ل ٦٤ ــ ۷۰ .

۵۰ــ محەمەد ئەمین هەورامانی ، رێنووس پەیرەوی زمانناسی بکا باشە ، گۆڤاری « ئاسۆی زانکۆیی » ، سلێمانی ، ۱۹۷۸ ، ژ ۱۰ ، ل ۸۸ــ۹۱ .

۵۱ــ رەئووفی ئەحمەد ئالانی ، دواوانێك بۆ رێنووسی کوردی ، رۆژنامەی « هاوکاری » ، بەغدا ، ۱۹۷۹ ، بەشی یەکەم ، ژ ٤٦۹ ، ل ٦ــ۷ ، بەشی دووەم ، ژ٤۷۱ ، ل ۳ ، بەشی سێیەم ، ژ ٤۷۲ ، ل ۳ ، ۷ .

۵۲ــ رەئووفی ئەحمەد ئالانی ، رێنووسی کوردیو چەند هەڵوێستێك ، رۆژنامەی « هاوکاری » ، بەغدا ، ۱۹۷۹ ، بەشی یەکەم ، ژ ٤۷۸ ، ل۳ ، **بەشی دووەم ، ژ ٤۷۹ ،** ل۳ ، بەشی سێیەم ، ژ ٤۸۵ ، ل۳ ، **بەشی چوارەم ،** ژ ٤۹۰ ، ل۳ .

(53) Qiraatî Kurdî. Nusrawa ba wastaî Muhammad Zakî Effendî we Mirza Muhammad Bashka Muallîmanî maktabî hukumatî Sulaîman îya. Tartîb krawa be wastaî Major E. B. Soane we Captain W.J. Farrell. Nashir krawatawa be wastaî Daîraî Maarîfî Baghdad, 1920.

۵٤ــ جەمال نەبەز ، نووسینی کوردی بە لاتینی ، بەغدا ، ۱۹۵۷ .

(55) Mîr Hereqol Azîzan, Rêzana Elfabêya Qurdî, Çapxana Tarekî, Sam, 1932.

(56) Celadet Alî Bedir—Xan, Rûpelinen Elfabê, Çapxana Tarekî, Sam, 1932.

(57) Osman Sabrî, Elifbêya Kurdî, Çapxana Kerem, Sam 1955.

۵۸ــ بڕوانە : د. جەمال نەبەز ، زمانی یەکگرتووی کوردی ، بامبێرگ ، ۱۹۷٦ ، ل ۸۳ .

۵۹ــ هەمان سەرچاوە ، ل ۸٤ .

٦۰ــ دەربارەی پەیدابوونی چوکلە بۆ ( ر )ی قەڵەو ، بڕوانە: سەرچاوەی ناوبراو ، کورتەیەکی مێژووی نووسینی کوردی بە ئەلفوبێتی عەرەبی ، ل ۸۹ــ۹۲ .

٦۱ــ بڕوانە ، سەرچاوەی ناوبراو ، (ی)ی ئیزافەو ( واوی عەتف ) ، ل ۱۵ ــ ۱٦ .



# من «دڵ»ی مامە عەبەم

«٢»

نووسینی : ج. د. راتکلیف

وەرگێرانی لە ئینگلیزی‌یەوە «ماهر وەسمان قادر»

**کەس ناتوانێ بڵێ من شتێکی جوانم ، سەنگیم نزیکەی «٢٧٥» گرامە، رەنگم سوورێکی تاریکەو شێوەیەکی زۆر دلگیشم نیە . من بەندەی هەرە خۆشەویستی مامە عەبەم . مامە عەبە تەمەنی ٤٥ ساڵەو ژنێکی جوانو سێ منالو کارێکی چاکی هەیە . من کێم ؟ من دلی مامە عەبەمو لێم گەرێ تۆزێ باسی خۆمت بۆ بکەم .**

بەهۆی پەردەیەکەوە بە ناوەراستی سنگی مامە عەبە شۆر بومەتەوە . درێژاییم شەش گرێ‌یەو درێژترین پانابیم چوار گرێ‌یەو تۆزێ لە شێوەی هەرمێ دەکەم . بەلام چاك بزانە ئەوەی شاعیرو نووسەرەکان بەمن هەڵدەلێن وانیەو من شتێکی رۆمانتیکی نیم، بەلکو،ئیش کەرێکم لەچوار ژوور پێك هاتووم، لەراستی‌دا لە دوو ترۆمپا پێك هاتووم، یەکێکیان خوێن بەرەو خوێن بۆ سی‌یەکانی مامە عەبە دەنێرێو ئەوەی تریان بەرەو ئەندامەکانی تری لەش . هەموو رۆژێ خوێن بەناو (٦٠.٠٠٠) میل لە بۆری خوێنی لەشی مامە عەبە پاڵ دەدەم، واتە بەو پاڵدانی خوێنە دەتوانین تەنکی‌یەکی ٤ هەزار گالۆنی پر بکەین . کە مامە عەبە بیر لەمن دەکاتەوە وا دەزانێ لە شووشە ناسکترم . ئابا چۆن وا دەبێ ئەگەر تا ئێستا ٣٠٠ هەزار تۆن خوێنم پاڵدابێ لە لەشی ئەو ...

کاری من دوو جار ئەوەندەی کاری ماسوولکەی قاچو دەستی بەهێزترین کەس گرانە .. هیچ ماسوولکەیەك لە لەشی مامە عەبە هێندەی من بەهێز نابێت .

**هەرچەندە شەوو رۆژ کاردەکەم بەلام لە نێوان هەردوو لێدانی خۆمدا بۆ ماوەی نیو چرکە پشوو دەدەم، کە مامە عەبە دەخەوێ ژمارەیەکی زۆر لە بۆری‌یەکانی بچووکی خوێن لەکار دەکەونو منیش ئەو کات خوێن بۆ ئەوان نانێرم، ئینجا لێدانم لە «٧٢» جار لە دەقیقەیەکدا دێتە سەر «٥٥» جار .**

... مامە عەبە زۆر کەم بیرم لێ‌دەکاتەوە، ئەمەش شتێکی چاکە . بەلام کە بیرم لێ‌دەکاتەوە بەهەلە دەچێ . شەوێکیان کە خەریك‌بوو بخەوێ، هەستی لێ راگرتمو لەناکاو وای زانی لێدانم یەکێکی کەم کردۆتەوە، بەراستی تەنگاو بوو . جارجار ئاوازی لێدانم ئەگۆرێو دوو لێدان نزیك‌یەك دەبنەوەو مامە عەبە وا دەزانێ یەکێکم لەبیر کردووە بەلام وانیە . کە مامە عەبە لەخەو هەڵدەستێ پاش بینینی خەونێکی سامناك، هەست دەکا لێدانم لە جاران خێراترە، ئەی نازانێ کە لە خەوەکەی رادەکا منیش وەك ئەو رادەکەم .

کە ئەو تەنگاو دەبێ من خێراتر دەبم. خۆ ئەگەر ئەو هێمن بێتەوە منیش هێمن دەبمەوە . رێگایەکی تریش هەیە هێمنم بکاتەوە ئەویش بە شێلانی هەر دوو پاش گوێچکەکانی خۆیەتی .

کە مامە عەبە زۆر ماندوو دەبێت یاخود تووشی سەر سووران دێت، من بە تاوانبار دەزانێ . خۆ من هیچم بەسەر ماندوو بوونو سەر سوورانی ئەوەوە نیە . هەندی جاریش کە لەتەك مێزەکەی دادەنیشێو کار دەکات لە ناو سنگی‌دا ئینجا وا دەزانێ تاوانی هەرس کردنی ئەو خۆراکە چەورەیە کە دوو سەعات پێشتر خواردوویەتی . ئەگەر من گیروگرفتێکم هەبێ خۆم دەزانم ئازاردانێکی چۆنی دەکەم .

**من چۆن وزەی خۆم وەدەست دێنم؟؟ شتێکی روونە لە خوێنەوە وەدەستی دێنم . هەر چەندە من بەشێکم لە دوو سەد بەشی لەشی مامە عەبە بەلام پێویستیم بە یەك لەسەر بیستی خوێنی لەشی ئەو هەیە . واتە پێویستیم بە دە ئەوەندە وزە هەیە کە هەر ئەندامێکی تری لەشی ئەو پێویستی پێ هەیە .**

من وزە لەو خوێنە وەرناگرم کە بە ژوورەکانمدا تێ‌دەپەرێ بەلکو وزە لە دوو شاخوێن‌بەرەکانی خۆم وەردەگرم

هەر ئەو دوو خوێن بەرانەشن من ددخەنە مەترسی‌یەود. ئەو مەترسی‌یەی ددبێتە هۆی مردنی مامە عەبە . کەس نازانێ ئەم مەترسی‌یە چۆن ددست پێددکا . هەندێ جار لەرۆژانی ژیان‌و هەندێ جار لەکاتی لەدایك بووندا چەورایی لەناویاندا ددبێتەودو نەختە نەختە ددبێتە هۆی ڕێگا گرتنی خوێن .

مامە عەبە نەودی خێزانێکە کە زۆر کەسیان تووشــــــی نەخۆشی دڵ هاتوون بۆیە بەپێی هەموو لێکدانەودیەك زۆر لە گوێنە منیش ببم بەهۆی ئازاردانی ئەو .

دەبا بێینە سەر کێش : مامە عەبە گاڵتەی بەوە دێت کــە پێی ددڵێن قەڵەود بەڵام ئەوە ئیشی گاڵتە نیە چونکە ددبێ باش بزانین کە هەر کیلۆیەك لە گۆشت ۲.. میل بۆڕی خوێنی تێدایە جاودڕێم ددکا خوێنی تیا بنێرم بەرەو ئــــەندامەکانی لەش .

ئینجا بێینە سەر پالە پەستۆ : لە تەمەنی مامــــە عەبەدا بەرزترین پلەی ئاسایی پالەپەستۆی خوێن ددبێ ۱٤۰/ ۹۰ بێت. ۱٤۰ ، پالەپەستۆی خوێن نیشان ددد! لە کاتی کارکردنمدا . ۹۰ ایش لەکاتی پشوودانمدا . ژمارە بچووکەکەش لــــــە گەورەکە گرنگترە . چەندە بەرز بێتەوە مانای ئــەودیە ماودی پشوودانم کەمترەو بەرەو مردن ددڕۆم . زۆر ڕێگا هەیە مامە عەبە بتوانێ ئاستی پالەپەستۆی خوێنی خۆی دوور لە مەترسی ڕاگرێ . یەکەمیان خۆ ڕزگار کردنە لە قەڵەوی . دووەمیـــــان جگەرە نەکێشانە . ڕۆژ نی‌یە مامە عەبە چل جگەرە بەبا نەکــا کێشانی هەر جگەرەیەك لێدانم لە ۷۲ ترپە ددگەیێنێتە ۸۰ . کە خەڵك پێی ددڵێن جگەرە مەکێشە ددڵێ کات بەسەر چوو . ئەودی قەوماوە قەوماوە بەڵام واش نیـــــە . سێ‌یەمیان خۆ ماندوو نەکردنە . خۆ مامە عەبە ـ ماڵی بەقوڕ نەگیرێ ـ شەوو ڕۆژ حەسانەودی نیەو هەر کار ددکا . ئەگەر ناود ناود لێی ڕاکشێ ئەوا منیش تۆزێ حەوانەودم ددبێ . چواردمیـــــــــان مەشق کردنە . پێویستە مامە عەبە لەو تەمەنەدا ڕۆژی یـــەك دوو میل ڕێگا بڕوات . دوا ڕێگاش ئەودیە مامە عەبە ئاگاداری ژدمەکانی بێ‌و چەوری زۆر نەخوا .

**خۆ من دوژ منایەتی‌ی مامە عەبە ناکەم ، ئەگەر ئەو تۆزێ ئاگاداری من بێ‌و زوو زوو پشوو بداو واز لە خواردنی چەورو کێشانی جگەرە بێنێ ئەوە تا تەمەنێکی درێژ خولامەتی ئـــەو دەکەم . من بۆ ئەومەو ئەو بۆکێ ؟**

---

**تێبینی**

**ناوەکە لە دەقە ئینگلیزی‌یەکەدا ( جۆن )ە .**

# ئیدمۆندز

# لە شێخ ڕەزا دەدوێ

**ئامادە کردن و وەرگێرانی لە ئینگلیزی یە وە عومە ر کویی**

**• شێخ رە زای تاڵە باني لە شاعیرە بە رزە کانی کوردە ، نە ك هە ر لە ناو گە لی کورددا ناسراوە و ناوبانگی دە ر کردووە بە ڵکو لە ناو بێگانانیش دا نا سراوە و دانیان بە دە سە لاتی ئە دە بی و شاعیری یە تی ئە م شاعیرە ماندا داناوە و لێکۆ ڵینە وە و باسی ئە دە بی یان لە سە ر نووسیوە ، یە ك لە وانە نووسە ر و سیاسی ئینگلیزی (ئێد مۆندز) (Edmonds) لە کتێبە کە یدا KURDS Turks AND ARABS[1] لە باسی ژیان و شاعیری یە تی ئە و کە لە شاعیرە ماندا دە ڵێ :ـ**

**« شیخ رە زا لە ساڵی 1840ز لە دایك بووە و لە ساڵی 1909 دا کۆچی داوایی کردووە[2] لە کاتی لا وێتی دا سە ری لە و وولا تانە داوە کە لە ژێر دە سە ڵاتی فە رمانر ە وایی عوسمانی یە کاندا بوون ، سە ردانی ئە ستە مبۆڵێ کردووە و هە شت ساڵ لێ ی ماوە تە وە و بۆ ماوە ی دوو ساڵیش بووە بە مامۆ ستای کورە کانی خدێوی میسر لە و وولا تە دا و زمانی فارسی فێر کردوون . لە دوایی دا گە ڕاوە تە وە ئە ستە مبۆڵ و بۆ. ماوە یە کیش لە وێ ماوە تە وە و لە پاشدا جووە بۆ حە ج و لە کۆتایی دا گە ڕاوە تە وە بۆ کە ر کووك و ماوە یە ك لە وێدا ژیاوە و ئینجا جووە بۆ بە غدا و لە وێدا نیشتە جێ بووە تاکوو کۆچی دوایی کردووە . »**

**میستە ر (ئێد مۆ ندز) هە ر تە نیا لە ژیانی ئە م شاعیرە ناو دارە مان نادوێ بە ڵکو باسی هۆ نراوە پتە وە کانیشی دە کات و دە ڵێ :ـ**

**« شێخ رە زای تاڵە بانی ـ لە پاشی حاجی قادری کۆیی ـ بە ناو بانگترین شاعیری کوردە و**



هـۆنراوه‌كـانی ئـاوینـه‌یـه‌كـه‌ خـوو ره‌وشت و ره‌فتار و نه‌ریتی ئه‌و كۆمه‌ڵه‌ پیشـان ده‌دات كه‌ تیـدا ژیـاوه‌ بـه‌زۆریش لایـه‌نی شیعـری داشۆرینی گرتووه‌ .»

نووسه‌ری ئینگلیـزی هه‌نـدێ له‌ هـۆنراوه‌كـانی شێـخ ره‌زاری وه‌رگێـراوه‌ بـۆ سـه‌ر زمـانی ئینگلیزی و له‌ كتێبه‌كه‌یـدا بلاوی كـردۆته‌وه‌ ، لـه‌وانـه‌ هـۆنـراوه‌یـه‌كێتی بـه‌ نـاوونیشـانی (A — GAME — COCK) واتـا (یاری كـه‌ڵه‌شێر) كه‌ له‌ كورد یدا پێی ده‌گۆتری (شه‌ره‌كه‌ڵه‌شێر) و ئه‌مه‌ش هۆنراوه‌كه‌یه‌ (3) :-

كه‌ڵه‌شێرێ به‌ (ره‌زا) لازمه‌ كرماشانی
زیره‌ك و چابووك و ده‌م كه‌رم و درو شه‌ڕانی

كه‌ڵه‌ شێرێ كه‌ قه‌پی گرت له‌ بنا گوێی كه‌ڵه‌شێر
پڕ به‌ ده‌م بیپچڕێ وه‌ك سه‌گی هه‌ورامانی

كه‌ڵه‌شێرێ كه‌ ئه‌گه‌ر شێری نه‌ڕی بێته‌ مه‌ساف
رای رفێنێ به‌ شه‌قێ میسلێ كه‌ری تالانی

به‌ درێژی وه‌كوو مه‌ولان به‌گه‌كه‌ی میری به‌یات
به‌ جه‌سامه‌ت وه‌كوو كوێخا زله‌كه‌ی بیبانی !

ئه‌ی نه‌قیب زاده‌ ، بنێره‌ كه‌ڵه‌شێرێكی وه‌ها
بۆ (ره‌زا) كه‌ سه‌گه‌كه‌ی عقابیه‌كه‌ی كه‌یلانی !

نووسه‌ر پـارچه‌ ,, هـۆنراوه‌یـه‌كی تری شێـخ ره‌زای كـردووه‌ به‌ ئینگلیـزی و ئه‌ویشی بـه‌ نـاوونیشـانی (ئێستـری دیـاری) ه‌ (THE GIFT MULE) ، وه‌ئـه‌مـه‌ش چـه‌نـد دێـرێكـه‌ لـه‌ شعیره‌كه‌ :-(4)

میر به‌صه‌د مینه‌ته‌ هه‌ناردی ئێستریكی رووت و قووت
ده‌ست و پـاسست و سه‌قـه‌ت ، ئه‌نـدامی هه‌روه‌ك عه‌نكه‌بووت

خاوه‌نی نالیكی نالێم پێ نه‌داوه‌ موتله‌قا ،
داویه‌تی ئه‌مما وه‌كوو بیستوومه‌ قووتی لایموت

ئینجا (ئێد مۆندز) ده‌ڵێ :« شێـخ ره‌زا پێش مردنی پارچه‌ هۆنراوه‌یه‌كی به‌ زمانی فـارسی داناوه‌ بۆ ئـه‌وه‌ی دووای مردنی له‌ سـه‌ر گـۆڕه‌كه‌ی هـه‌ڵكه‌نـدرێ وه‌ له‌ گـۆڕستـانی « گـه‌یـلانـی » بـنـێـژرێ و ئــه‌مــه‌ش هـۆنراوه‌كـه‌یه‌تی كـه‌ سه‌ره‌تـاكه‌ی بـه‌م ووشه‌ ئینگلیزیانه‌ ده‌ست پێ ده‌كا (O Apostle of God) وه‌ ده‌قه‌كه‌شی به‌م جۆره‌یه‌ :-(5)

یا رسول الله چه باشد چون سگی اصحاب كهف
داخل جنت شوم در زمره ای احباب تو

او رود درجنت ومن در جهنم كی روا ست ؟
او سگی اصحاب كهف و من سگی اصحاب تو .

## سه‌رچاوه‌و , په‌راوێزه‌كان

(1). بـروانـه‌ [KURDS , TURKS AND ARABS] ئێد مۆندز ، لندن ، 1957 ، ل : 290

(2) هه‌رچه‌نده‌ نووسه‌ری ئینگلیزی ساڵی له‌ دایك بوونی شاعیری به‌ 1840 و ساڵی كۆچی داویی به‌ 1909 داناوه‌ ، به‌ڵام راستی یه‌كه‌ی ئه‌وه‌یه‌ له‌ 1832 له‌ دایك بـووه‌ وه‌ لـه‌ 1910 دا كـۆچی داویی كردووه‌ .
بـروانـه‌ : [د. عیـزه‌ددین مسته‌فـا ره‌سوول- شێخ ره‌زای تاڵه‌بانی ، ل : 3

(3) - بـروانه‌ [KURDS , TURKS AND ARABS] ئێد مۆندز ، لندن ، 1957 ، ل : 292

(4) - بـروانـه‌ سـه‌رچـاوه‌ی پێشوو ، ل : 294

(5) - بـروانـه‌ سـه‌رچـاوه‌ی پێشوو ، ل : 295

# لەگەڵ دیداری دووەمی چیرۆکی کوردیدا / بەشی چوارەم

# سێ چیرۆك و تیشکێکی ڕەخنەگرانە

رەووف عوسمان

## ١- لە ئاهەنگی شۆڕێکی ئەم شارەدا ..

عەبدوڵلا عەزیز خالد
سلیمانی

دوای بیر کردنەوەیەکی قوڵو وردی چەندان شەوو ڕۆژی خەماوی‌و تاڵ ، پێی بەجەرگی خۆیدا نا ، چەند دڵۆپێ فرمێسکی حەسرەت‌و شادی زایە چاوە گەشەکانی ، ئەوسا بەدەستێکی لەرزۆکەوە بەرگە ڕەشەکانی فڕێدا ، لەگەڵ نەرمە گریاندا بزەیەکیش لێوە وشکەکانی لەراندەوە ... خەڵکە ئاساییەکەش گلەییان لێدەکرد : [ خۆ چەند مانگێکە « مێردو کوڕێ » جوانەمەرگ بوون ! ] .

دایکی ئازاد ، ئافرەتێکی کەڵەگەتی لەش پڕی گەنم ڕەنگ بوو ، تەمەنی (٣٥) ساڵ دەبوو ، دوو چاوی گەشی ڕەش ، پرچێکی درێژ بەشان‌و ملیا هاتبووە خوارێ ، کە پێدەکەنی ڕوومەتەکانی چاڵ دەبوو ، ئەمە ئەوەندەی تر جوانی کردبوو .

ئەو هەر تاوەی بەجۆرێك دەبینرا ، دەمێ خۆی تاس دەداو ساتێك ماتیەکی خەست دای دەگرت‌و خەیاڵی قوڵ دەیبردەوە ، وەك بیر لەشتێکی دووری سامناك بکاتەوە ... نەء، هەر هەموو ئەوانە بۆ داپۆشینی هەڵوێستەکانێتی :

(بابە ئاڵۆشەکەی ئارامی لەبەر هەڵگرتوەو هەر ڕۆژەی بەبەر یەکێکەوەیە ! ... چونکە زۆر جار ئارایشتی دەکردو لەبەر کۆڵانەکەدا دادەنیشت و هەندێ ڕۆژیش خولێکی بەقەیسەریدا دەدا ).

مەحالە شێوەی جارانی تیا بەدی بکرێت ، هەم بێ ڕووەو هەم چاوو ڕووی نەماوە .

پاش ئەوەی نزیکەی سێ هەفتەیەك بەسەر گۆڕینی بەرگە ڕەشەکانیدا ڕابورد ، دەرۆژێ دەبوو ( بریگادێر پیتەر ) دەورو خولی ئەو ناوەی دەدا ... پیتەر تەمەنی (٣٠) دەبوو ، باڵای مام ناوەندی ، تێکسمڕاو ، لە ئینگلیز نەدەچوو ، سەلیبێکی ئاڵتونی لەملدا بوو .

چاوە برسیەکانی پیتەر گورگێکی دەم هار بوون ، نەء ، ناهەقی نییە ، دەمێکە هاتۆتە ئەم شارە ، کە قسەی دەکرد نەت دەزانی خەڵکی ئێرە نییە ، ڕەوشتێکی بەربادی هەبوو ، وێڵی دۆزینەوەی ئافرەتی سۆزانی بوو .

دایکی ئازاد لەو شەوەدا تەنیایە ، ئاڵۆزی دەروونی تەواو ئازاری دەدات ، بێزارە ، جاروبار دیدەنیەکی تاقی کتێبەکانی ئازاد دەکات ، پاش ئەم دیو ئەو دیو پێکردنیان تێر بۆنیان دەکات ، لە ژێر کتێبەکاندا کۆنە نامیلکەیەکی ئازیزی دۆزیەوە، چاوێکی خێرای پیاگێڕا ، کەچی وزەی خوێندنەوەی نەبوو . لەو ساتەدا ژاوە ژاو لەکۆڵان پەیدا بوو ، ئەم دەربەست نەدەهات ، ئەو شەوەی هاتەوە بیر کە چۆن دز هەڵی کوتایە سەرماڵی خاتە بێوەژن‌و ئەم بەر لەباوکی ئازاد گەیشتە سەری‌و دزەش بەشەرمەزاریەوە، لەبەر دەمیا هەڵهات ، لەمەدابوو ؛ تەق تەق لەدەرگا درا .

ــ کێیە ؟ .

ــ بیکەرەوە .

ئیتر هەر دووان و سیان پەیژەیان بەگوێسەبانەکانەوە دەناو سەردەکەوتنە سەرەوە .

بریگادێر پیتەر خۆی لەبەر دەرگای ئەماندا وەستابوو . یاساوڵێکی چەتون بەچپە دەمی نایە پەناگوێی ئاوەڵێکیەوە :

ــ پیتەر ئەم بەزمە لەبەر خاتری خۆی سازدەکات .

لەگەڵ دەرگا کردنەوەدا ، بێ سێ‌و دوو خۆی بەژوور کردو بەنەزاکەتەوە ڕووی لەدایکی ئازاد کرد :

ــ مەسلەمێرەوە ، مەبەستمە دڵنیات کەم هیچ ترسی ناوێت ، بۆ پەرێزی ماڵەکەی ئەوبەرتان هاتووم .

پیتەر ڕووی کردە بەردەستەکانی :

ــ وەك پێم ووتن بەو جۆرە دابەش بن .

کە ئەوان ڕۆیشتن ئەوسا لەدایکی ئازاد نزیك بووەوە:

ــ بەڕاست پەیژەتان نییە ؟... ئەی لەکوێیەوە بۆ هەورە بانەکەتان دەچن ؟ .

هەر لەبەر خۆیەوە :

ــ ئای کە جلو بەرگی کوردی قەشەنگە !.

ژنە بەسەر وەڵامی دایەوە .

پیتەر وەك کابرایەکی نامۆ خۆی نیشان نەدەدا :

ــ وڵاتێکی خۆشتان هەیە .



ژنە بێدەنگ بوو . کـەچی پیتەر بـەکەش‌و فشێکەوە لێی هاتە پێشێ :

ــ ئێستا من حوکمی ئەم شارە دەکەم . کەس ناتوانێ ورتە بکات . هەر خۆی بەدەم قاقایەکەوە :

ــ ئا ... ئا هاتەوە بیرم ؛ بەڕاست دوێنێ شەو لە مالەکەی ئەوبەرتان چی ڕوویدا ؟ ... نەی هێشت ژنە وەلام بداتەوە ــ تینوومە .

دایکی ئازاد بەرەو دالانەکە ڕۆیشت ، پەرداخێ ئاوی هێنا ؛ لەدلی خۆیدا :

ــ ( چاو چاو ؛ لەو هێمنی‌و ڕووە خۆشە . خۆ خوێنی قولپ دەدات ئەم قـسەیەی دایکی ئازاد بۆ چوونی پێشوی خەلکە ئاسایەکەی لەسەر کرد بەمال .

بەخۆیدا چوودوە . تەزوویەکی بەهێز ڕایچلەکان .

ــ نا..نا . تاوانبارە . هـەر ئـەم بـەدەستی خۆی مێشکی باوکی ئازادی پژان ) .

دایکی ئازاد لەگەل ئەو جۆرە قـسانەدا دەژیا ، کـە کەلەشێری مالە دراوسێکەیان دووجار لەسەریەك خوێندی‌و هوشیاری کردەوە .

پیتەر ئاوەکەی وەرگرت . شادبوو . بەتایبەت کە گرژی لەڕووی ژنەدا نەدەبینی .

پیتەر دوای ئەمکەین‌و بەینە . بەچـاو تێی گەیـاند : ( دەبەوێ تاسەی ئارەزووی بشکێنێ ؛ لەگەلی دوا :

ــ بێ مێردی ناخۆشە !.

ماتی ژنەی داگرت ... باوکی ئازادی هاتەوە یاد کە چۆن لەتەمەنی (٤٠) سالیداو لەبەرە بەیانێکی زووی مانگی جـۆزەردانـدا بـەدەسـت ڕیژێ دلی لەلیـدان خراو تـا چێشتەنگاوێکی درەنگ لەبەر دەرگای مزگەوتە ڕووخاوەکەدا خرابوو . تا دوایی خۆی و ئازادو چەند ئافرەتێکی گەڕەك ؛ لەژێر تووەکەی مالی خۆیاندا ناشتیان . دوای خامۆشیەکی خەماوی بەهێمنیەوە ڕووی کردەوە پیتەر:

ــ بەمردن یان بەدوور کەوتنەوە ؟.

ــ ئێستا کاتی ئەم قـسانە نیە . هەر کەناوی مردن دێنی سام دەمگرێ ژنە لەدلی خۆیدا :

ــ ( خۆ دوێنی ئێوارە بەدەستی خۆی دوو گەنجی ئەم شارەی کوشت . لەم ساتەدا چەتەولێکی بەردەستی زۆر بە ئەدەبەوە لە دەرگای داو هاتە ژوورەوە :

ــ بەگم ... ، کاتی ئەوە هاتوە بەسەر مالەکەی ئەو بەردا بدەین . پیتەر نەڕەیەکی بەسەردا کرد :

ــ بڕۆ دەرێ . کاتی ماوە ، خۆم ئاگادارتان دەکەمەوە . کوڕە چووە دەرێ‌و پیتەریش بەژنەی ووت :

ــ شەربەتتان هەیە ؟ پەرداخێکم بۆ ناهێنی ؟!

بەدەم قـسەکردنەوە لێی هاتە پێشێ :

ــ نا ... نا ، شۆخەکەم مەپەشۆکێ ، دلنیابە ، تامن لەم شارەدابم کەس ناتوانێ پێت بلێ لەل ... دەزانم کاتیش درەنگەو تۆش خەوت دێت .

هەر لەبەر خۆیەوە :

ــ ئێمە کارەکانمان بەشەو ئەنجام دەدەین .

دایکی ئازاد بەنیـازی ئەوەی پەرداخێ شەربەت بێنێ لێیداو ڕۆیشت . بەدەم ڕێگەوە دەدوا :

ــ خوا ناردوێتی ، دەی خەلکی چی دەلێن بابلێن ، من بەگوێی خۆم دەمبیست کەدەیـان ووت : (فڕێدانی بەرگە ڕەشەکەی نیشانەی حەیا تکانێتی ) .

هەر کە ئەو قـسەیەی دەکەوتەوە یاد زیاتر گرژ دەبوو دەی ووت :

ــ باشە منیش وەك هەموو ئافرەتێکی تر نەفسم نیە ؟

لەم لاشەوە پیتەر گەشکە دەیگرت :

ــ باش ڕاهات . بابە بە خوڕایی ئێرەیان نیشان نەداوم ، شەفەی حەلاو ڕاستیکرد کە وتی : (شۆخی وا نەبۆتەوە ، دلنیام ئەمجارەیان مزگێنیەکەم پێ دەبڕێ ) ... ئەو هەتیوە ڕاستی کرد ؛ هەموو شتێ دەهێنێ . ئێستا هەر وەك لـــە ئاپارتمانێکی ئینگلتەرەدا بم وایە . تازە لەژێر چنگم بۆ کوێ دەردەچێ؟

لەولاشەوە دایکی ئازاد لە دالانەکەدا لەبەر خۆیـــەوە دەیبووت :

ــ خۆ شەکری کلۆشمان هەیە بۆ دیشێکی بۆ نەبەم ؟ هەر خۆی وەلامی خۆی دایەوە :

ــ نا .. نا..ئەمەیان نا ، ئەویان باشترەو بردی‌و خستیە تاقەکەی ئازادەوە .

دوای ئەو قـسانە دەستێکی بەخۆیدا هێناو پەکەوایەکی گوڕوونی گول باتمانیەوە لە دالانەکە پەرداخێ شەربەتی برد ، بەدەم خەندەیەکی مەستەوە بەرەو لای پیتەر ڕۆیشت‌و ئەویش گورج بەرەو پیری چوو . بە پێکەنینەوە :

ــ زەحمەتم دایت .

هەر زوو پەرداخەکەی لێ وەرگرتو ئەویش بێ خۆتێکدان لەلایەوە ، وەستا ، تەماسی لەشی تەزوویەکی گەرمو خۆشی بەسەرتاپای لەشیدا هێنا ، خەریك بوو لەچاوی ئەو فرێك هەڵدات کەدایکی ئازاد بەنــازو لەنجــەیەکی قەیرە کچانەی سەرنج ڕاکێشــەرەوە وتی :

ــ من کەمێك ماندووم ، خەوم دێت !.

بەدەم نیگایەکی گەرمەوە تێی گەیان کە دەیەوێت بـــە جووت بچنە ژووری نووستن !

پیتەر چاوەڕێی ئەوە نەبوو هەروا سوکو ئاسان دەستە مۆبێت لەخۆشیاندا نەیدەزانی چی بکات . پەرداخەکەی هــەر بەدەستەوە بوو کە دوا بەدوای ژنە خۆی بەژوورا کرد .. ژنە چووە بەردەم تاقی کتیبەکانی ئازادو پیتەریش لەگەڵی . لەوێدا ژنە هەڵوێستەیەکی لەناکاوی بۆکرد و خەندەی چاوەڕوانی ، بەرووی پیتەردا هەڵدەدا ، ئەویش بێ دڵە کوتێ لێی نزیکتر بووەوەو لە تەنیشتیەوە وەستابوو . کە دایکی ئازاد مێخــــەك بەندەکەی ملی پچڕاندەوە ، پیتەریش گورج بێریەکەی ســـەری داگرتو پەرداخەکەی سوك لەسەر زەویەکەداناو بەچیچکانەوە دەستی کرد بەچنینەوەی موورو گوڵنگە مێخەکو لەبەر خۆیەوە دەی ووت :

ــ نا .. نا ، شۆخەکەم ، خەفەت مەخۆ ، هەر بەزوویی بۆت کۆ دەکەمەوە .

پیتەر هەر بەچیچکانەوە بوو سەرێکی هەڵبڕیو رووی کردە ژنە :

ــ با ئەمجارە سەر لە لەندەن بدەم ملوانکەیەکی ئەڵماست بۆ دێنم . ئیتر سەری دانەواندەوەو خەریکی چنینەوەی مێخەك بەندە پچڕاوەکە بوو کە لە بەر خۆیەوە ووتێ :

ــ بەڕاست نازانی کێ کوڕەکەتی کوشت ؟

وشەی ( کوڕەکەت ) تەواو دایکی ئازادی هەژانو دنیای لەبەر چاو تاریك کرد . چونکە ئازادی پانزە ساڵانە تەنیا کوڕی نەبوو ، بەڵکو دوای جوانــە مــــەرگ بوونی باوکی ، کوڕو هاوڕێی ماڵەوەو دەرەوەی بوو ..

، ئەو ڕۆژە تاڵەی لەیاد نەدەچوو کە دوای بـرینداركردنی بەلاقی ڕاست تاگیانی دەرچوو بەسەر خۆڵو بـــــەردەڵانی گەڕەکدا رایان کێشا .

دوای ئەو بیرەوەرییە سامناکە ، ئاوڕێکی هوشیارانەی دایەوەو سوك دەستی بو ناو تاقەکەی ئازاد بردو (تەشوێ)کەی دەرهێناو تا هێزی تیابوو کێشای بە تەپڵی سەریدا ، ئەوسا بە دەنگێکی کپەوە وەڵامی دایەوە :

ــ بەرێ وەڵڵا زانیومە کێ کوشتی !!.

بریگادێر پیتەر هەناسەی لەبەربڕا . هێدی هێدی کووڕ دەبوو ملی کەچو نەوی بوو . تا دەمی لەخوێنو گلەکە چەقی.. ئەوسا دایکی ئازاد بەهێواشی عەباکەی لەخۆیەوە ئاڵاندو دەرگای حەوشەکەی کردەوەو بەپێکەنینەوە ڕووی کردە یاســـاوڵی بەر دەرگاکە :

ــ جارێ مەرۆنە ژوورێ . پیتەر خۆی لەبەر نەکردۆتەوە . ئەوسا بەدەم بزەیەکی گەشەوە :

ــ من هەر ئێستا دەگەڕێمەوە لاتان .

یاساوڵی بەر دەرگاکەش گـــەنجێکی ڕەشـــــتاڵەی باریکەلەبوو ، بەدەم خەندەیەکی نەرمەوە بانگی ئـــاوەڵەکەی ئەوبەر کۆڵانەکەی کرد :

ــ چاو ... چاو ، دەی بۆ خۆت لێیدە لەغەزو بــەز مستەر پیتەر .!

## ٢- مەلەکان بەرەو کوێستان ئەگەڕێنەوە

**مستەفا سالح کەریم**

ــ بۆ کەمێک نانوی ؟ ، تۆ دوێنێ شەویش نەنوستی، ئاگادارت بوم تا بەرە بەیان هەر چلەی چاوت دا !

ــ خەوم لێ ناکەوێ .

ــ هەوڵ بدە .

لەبەر دڵی حــەینی هاوڕێی لەسەر قەرەوێڵەکـــەی ڕاکشاو بەتانیەکەی لە خۆیەوە ئاڵاند ، بەڵام ســـــەرلەنوێ زامەکانی لەشی دەمیان کردەوە ، وەك بەمست خوێیـــان تێبکرێ کەوتنە کزانەوە . وای هەست ئەکرد گیانی خەریکـە شەقار شەقار ئەبێ ، هەر ئەوەبو گوێی لەدەنگی لەتو پـەت کردنەکەی نەبو .

« چ هەواڵێکی جەرگ بڕ بو . لەم غەریبیە هەر ئەوەم کەم بو » ، ژورێکی ساردو سڕ ، پلرچە کومبارێکی بچوک لەنێوان هەردو قەرەوێلەکەدا ڕاخرابو ، مێزێك لە نێوانیاندا کۆمەڵێ کتێبی لەسەر کەڵەکە کرابو ، مێزێکی کەش لەدەم دەرگاکەوە شتومەکی چاێنانی لەسەر بو ، لەم لایشەوە جــل هەڵگرەیەک جلو بەرگەکەیانی پیا شۆڕ بویوەوە ، چاوەکانی بەهــــەموێنا

گیرا . بەڵام بەکزی گەرانەوە .

« ڕۆژان ئەم کاتە منو حسێن ئەنوستین ، کەمال و مەحمودیش لە ژورەکەی ئەو بەرمانەوە ئەنوستن . کاتێک خەبەرمان ئەبوەوە . یەکێکیمان کە نۆرەی بوایە چایەکەی لێ ئەنا ، دوای چا خواردنەوە ئەچوین بۆ پیاسە . دەمە دەمی ئێوارە ئەگەڕاینەوە . شەوەکەشمان بەخوێندنەوەو گفتو گۆی خۆش بەسەر ئەبرد . ژیانێکی وامان سازاندبو غەریبیمان پێوە دیار نەبێ . بەڵام ئەمڕۆ دو ڕۆژە لای من هەموشتێک گۆڕراوە. ئەو هەواڵە ناکاوە کارێ کردۆتە هۆشو هەستو دەرونم . ئەمەوێ خۆم وا پیشان نەدەم . بەڵام دەسەڵاتم نییە » .

زۆری هەوڵدا هیچ نەبێ کەمێک چاوەکانی لێك بنێ . ئەو چاوانەی بوبون بەگۆمی خوێن . خەمی دنیا لەسەر دڵی کەڵەکە بوبو . ئەو ڕۆژنامانەی دیوارە ساردو سڕەکەی ژور سەری تەنیشتیو بەرانبەری پێ داپۆشیبو . دێڕەکانیان لەبەر چاوی گەورە ئەبون تابونە مانشێتێك « کورەکەی گیراوە » .. « چەند بە ئاسانی هەواڵەکەیان گەیاند . وەك چوبێ بۆ سەیران . یان لەگەشتی قوتابخانە بێت .. » .

هیچی تر خۆی پێ نەگیرا . هەستی‌کرد ئەگەر نەچێتە دەرەوە لەوانەیە بخنکێ . هەناسەی سوار بوبو . پیشی ئەخواردەوەو لیوەکانی ئەکرۆشت . بە پەلە بیجامەکانی فرێ‌داو بەرگی دەرەوەی لەبەر کرد . بە ئەسپایی بێ ئەوەی هاوڕێکەی بە ئاگا بێت چوە دەرەوە .

لەشێکی سربوی کلێش ئەکرد . ئەملاو لای خوێ نە ئەبینی. ئەشێ چەند ناسیاو یێکیشی بە چاو دیبێ . بەڵام هۆشی لایان نەبو . گەیشتە سەر ڕاستە شەقامی شارەکە . بەبەر ئوتێلی شارەوانیدا تێپەری . سەیرێکی بەر دەرگای سینەماکەی کرد ئەتوت حەڵواکەی ئەحەی جاودو مێش تێداوە . بەڵام ئەوەندە سەرنجی نەدا بزانێ ج فلیمێك نیش ئەکات . گەیشتە لای چاخانە گەورەکەی ( ئەبو شەهاب ) کە بەردەرگاکەی بە پاسکلی دانیشتوان تەنرابو . سەری بەرز نەکردەوە بۆ ئەوەی خەڵکەکە نەبینێ . لە تواناشیا نەبو سڵاو لەکەسیان بکات .

لە نزیك مزگەوتە گەورەکەی تەنیشت سەراوە خەریك بو خۆی لە ستونێکی کارەبا بداتً . تا ئەهات لەشی زیاتر دەرزی ئاژن ئەکرا . خەم زیاتر سەری ئەکرد . بڕیاری دا سواری پاس نەبێت . هەر بەپێ ئەو شەقامە درێژە بیڕێ . ئەگەرچی خۆشی نەیئەزانی چی ئەکاو بۆچی بە تەنیا ئەم شەقامەی گرتۆتەبەر . بەڵام لەناخەوە جۆرە هەستێکی تایبەتی بەرە شوێنێکی ئەبرد .

لەپردە ئاسنینەکەی قەراغ شار نزیك بوەوە . ئیستێکی کرد . سەری ــ هەڵبری . چاوی بەدو ژورە بچکۆلەکەی سەر گازینۆکە کەوت . « پار . لە کۆتایی مانگی مایسدا بەسەردان هات بۆ لام ، چەند شەوێ لەم ژورەدا لەگەڵمانا مایەوە . ئێواران بەناو باخچەی گازینۆکەدا پیاسەی ئەکردو تێر سەیری گوڵەکانی ئەکرد . دوا ئێوارەش وتی : « بەس نیە ئەم شوێنەشتان دەست کەوتوە » . ئەی ئێستا لەکوێیە ؟ کام زیندان لەباوەشی گرتوەو گوڕەو شاری ئەدا ..!!!

ماوەیەك لە دوریانی نێوان هەردو پردەکەدا وەستا . چاوەکانی پڕبونە ئەو دوژورەی ئەتوت هێلانەی لەقلەقن کەساڵی پار گوزەرانیان تیا کردو لەدوایشدا ئەوەشیان پێ ڕەوا نەبینین و دەریان کردنە ددرەوە . بەرانبەر گازینۆکە پردێكو لەپشتیشیەوە پردێکی ئاسنین هەبو . ڕوباری فورات لەوێدا ئەبو بەدو لقەوە . هاژەی ئاوەکەی پشتەوە . وەك بانگەواز بۆ لای خۆی بانگی ئەکرد . چوە کۆڵانی ئەو دیو گازینۆکەوە . لۆژ لۆژ بەرەو پردەکەی پشتەوە کشا . تاو تاو . وەك خەو ببینێ دەستی کرد بە گریان . وا دیاربو زۆر پێویستی بە فرمێسك هەڵرشتن هەبو . « زۆر سەیرە ، لە ژیانما شەرابی ئەشکەنجەم زۆر نۆشیوە . هیچ باکیشم نەبوە . ئەی بۆ ئێستا بۆ ( دلێر ) وام لێ هاتوە ! دیارە وشەکانی باوکم ڕاست بون کە هەمو جارێ پێی ئەوتم : « ڕۆڵە . ڕەحمێ بە حاڵی من بکە » ، کەوابێ ناهەقی نەبو . منداڵ پارچەیەکە لەجگەری مرۆڤو یەکجار شیرینە » !..

چەند هەنگاوێکی ترو گەیشتە سەر پردەکە . لەقەراغەوە ئەڕۆیشتو لەنێوان شیشبەندە ئاسنینەکانەوە سەیری ڕوبارەکەی ئەکرد . شیشەکان لەبەرچاوی ئەبون بەقەفەزی گەورەو دەستو پەنجەی ناسکی چەندانێ وەك دلێر لەنێوان شیشەکانەوە دەر ئەکەوتن ..

« لەکاتی لەدایکبونی دلێرا لەسەفەر بوم . کە هاتمەوە . زەوی لە خۆشیانا ، نەیگرتمە خۆی . لەوساتەوە ئیتر خۆم لەودا ئەبینمە ، هەمو خۆشی دنیام بەودابو . هەرچی ئاواتێك لەژیانما لێی بێ بەری بویوم ، ئەمویست بۆ ئەوی بهێنمەدی ، نەمزانی یەکەم هەنگاو لەمەدایەك ئەگریتەوە من دەست بەسەرو دور خراوە ، ئەویش گیراوو بەند کراو » .

کە گەیشتە ئەوسەری پردەکە دەمارەکانی سڕبوبون ، هەمو لەشی گرمۆلە بوبو . ئۆتۆمۆبیلێکی شوپایی بەلایا تێپەڕی، ئێریەلە درێژەکەی ئەشەکایەوە .

ئێستا هەمو بیتەڵو تەلدارەکانی شارە بچکۆلەکەم بۆ بەجێ‌هێنانی فەرمانی سوڵتان لەکارا بە بروسکە ئەم هەواڵە ئەگەیەنن .

دلێر فەرهاد کەریم (.) تەمەن هەژدە ساڵ (.) پیشە

قوتابی (.) مەترسی گەورەی لێ دەکرا (خرایە ژێر چودێری‌یەوە (.) بەئاسانی بەبدەس کرا (.) هەر چەندە هیچمان لەلا نەدۆزیەوە (.) بەڵام پێویست بو بگیرێ (.) چونکە بزێوە (.) سەرکێشە (.) بۆ ئاگاداریتان (.) تەواو (.) » بەلای چەپی پردەکەدا بۆ گوێ روبارەکە شۆڕ بوەوە ، لەسەر لەکە بە ئەسپایی دانیشت ، پەڵە هەورەکانیش بەرێ ئاسمانیان بەر نەدابو ، هەر چەندە سەرەتای بەهار بو ، بەڵام هێشتا کزەیەکی ساردی هەبو ، چاوی بڕیە ئاوەکە، ڕەنگی لێڵ بو ، باراناوی سەرەوەی لەگەڵ خۆیا هێنابو، دەستی دایە چیلکەیەکو کەوتە هێڵ کێشان لە سەر لەکە ، لەگەڵ هەر هێڵێکدا کە چیلکەکەی ئەچەقاندە لەکە وای هەست ئەکرد خەنجەرێکی کولی ژەهراوی ئەچەقێتە پەڕەی دلی و خوێنەکەی تکتک لەکراسەکە ـ یەوە سەر دەر ئەهێنێ . « ئێستا لێم رونە ، دایکی وەکو هەمو ئێوارانی‌تر ئەو خواردنەی دلێر حەزی لێ ئەکرد ، ئامادەی ئەکات و لەسەر سفرەکە دایئەنێ ، چاویشی ئەبڕێتە دەرگای حەوشەو بەتەمایە بێتەوە ... تا درەنگانیش ئەو نانە هەروا ئەهێڵێتەوە . » .

دەنگی تەکسی‌یەك کە ئێواران خەلکی بۆ هۆبەکانیان ئەگەیاندەوە ، وریای کردەوە و ئاورێکی دایەوە بۆ پشتەوە . منالێکی بینی لەدوری بیست مەترێکەوە ، بەرەو قەراغ روبارەکە ئەهات ، نزیکتر بوەوە ، کتێبێکی بەدەستەوە بو ئەیخوێندەوە . هاتە ئەو لایەوە دانیشت . منالێکی سپیکەلەی چوونبرۆ ڕەشی ئێسك سوکی خاوێن ، تەمەنی لە نۆ سالان تێپەر نەئەبو . لەیەکەم دواندنیا تێگەیی خەلکی ئەم ناوچەیە نی‌یە بەیەك زمان کە لێك گەیشتن کەوتنە گفتو گۆ . منالەکە وتی :

ـ زۆر حەز ئەکەم ئێواران بێمە ئەم شوێنەو کتێبەکانم بخوێنمەوە .

ـ ئەی بۆ نایەیت ؟
ـ دایکم ناهێلێ .
ـ بوچی .
ـ ئەلێ ئێوارە وەختە گوێ ئاو باش نییە ، خێوی هەیە.
ـ لەراستیدا خێوی نییە . بەڵام دایکت لەئاوەکە ئەترسێ، ناحەقیشی نییە . ئاو بێ ئامانە .

« خێو نییە ، بەڵام ئاخۆ دلێر کام خێوی ناوەخت ئێستا دەستی لێ بوشێنێ !!» سەیرێکی منالەکەی کردەوە بەنیگای چاوەکانیا دیار بو تامەزرۆی گفتوگۆ بو ، لێی پرسی :

ـ باوکت لەکوێ‌یە ؟
ـ باوکم پاسەوانی بیرە لێدراوەکانە لە بیابانی خۆر ئاوای ئەم ناوچەیە . « هاوڕێ‌یەکم ئەم بەیانیە بە پەلە ، لە بیابانەکەوە تەلەفۆنی لەگەڵ کردم ، بەگەرویەکی گیراودوە هەوالی جۆلەکەکانی شارەکەمی لێ پرسیم » .

ـ سەرتان لێ نادات ؟
ـ بەپازدە رۆژ جارێ ، سێ رۆژ مۆلەتی هەیە .
ـ مالتان لە کوێوەیە ؟
ـ پەنجە بچکۆلەکانی بۆ خانوە بلاو بلاوەکانی ناو دار خورماکان راکێشاو وتی :

ـ ئا کەوێ داین .
ـ تۆ ئەزانی تا ئێستا پێت نەوتوم ناوت چی‌یە ؟!
ـ ئەردەلان .
ـ باشە ، ئەردەلان . ئەی لە دەرسەکانتا چۆنی ؟
ـ بەخوا جاران زۆر باش بوم ، بەڵام ئەمسال نەر !!
ـ لەمەو دوا هەمو ئێوارەیەك تالێرەبم و ئیشم نەبێ . دێمە ئەم شوێنە ، کتێبەکانت بهێنە دەرسەکانت پێ ردوان ئەکەم .

منالەکە کە گوێی لەم رستەیە بو روخسارو روی گەشایەوە ، بەرویەکی خۆشەوە وتی :

ـ ئاخر لێرە عەزێتە . بۆ نایەیتە مالی خۆمان ؟!
ـ نەر ، قەیناکا . ئێرە باشە ، جگە لەوەش تۆ خۆت وتت حەز لە دانیشتنی ئێرە ئەکەی . کە باوکیشت بەسەردان هاتەوە ئاگادارم بکە تا دیدەنیەکی بکەم .

ـ باشە ، هەرکە هاتەوە پێت ئەلێم .
ـ ئەگەر کۆتایی سالیش پلەی بەرزت هێناو نمرەکانت لە پێشەوە بون ، خەلاتێکی بەدلی خۆتت ئەکەم .

دەنگی ئافرەتێك دڕی بە بێدەنگی گرێ ئاوەکەدا ، منالەکە هەستایە سەرپێو ئەختێ جلەکانی تەکاند و وتی :

ـ مامە ، ئەوە دایکمە بانگم ئەکات . ئەبێ ئیتر بڕۆمەوە.
ـ باشە منیش تا نزیك مالەکەتان رەوانەت ئەکەم .

چیلکەکەی دەستی فڕێ دایە ناو ئاوەکە، هەستی کرد بەرە بەرە خەمەکانی سەر دلی بچوك ئەبنەوەو لە خەمە گەورەکانی ئەم خەلکەدا ئەتوێنەوە ، ئەمجا دەستە بچوکەکانی ئەردەلانی خستە ناو دەستیەوە و بە پێکەنینەوە بە ناو دارخورماکانا بەرەو خانوە بچوکەکەی سەرپەڕ ، تەکانیاندا ، تا بەتەواوی نزیك بونەوە منالەکەی رەوانە کردو خۆی بەرەو پردەکە رۆەو بەو شار گەڕایەوە ، تاك تاکەش مەل بە ئاسمانەوە ئەیاندایە شەقەی بالو بەناو درەختەکانا تیر تێ ئەپەڕین ، سەری بلند کردەوەو لە دلی خۆیا وتی :

« وا دیارە مەلەکان بەرەو کوێستان ، ئەگەڕێتەوە ..!»

سلێمانی

مارتی ١٩٨١



# ٢- هەڵۆ

**ڕەووف بێگەرد**

هەرکە لەدەرگای ماڵەوەیان هاتە دەرێ ، وەك هەموو رۆژانی تر ملی رێگاکەی گرتەوە . لەسەرەتاوە هەنگاوەکانی کورتو سست بوون ، هێشتالەشی خاوبوو . دەمێك لارە لارەی دەکردو جارێك تەکانی ئەدایە خۆی . وەك شەقاوەکانی بست بەبستی رێگاکە شارەزابن خۆیان لە چاڵو چۆڵی دەپاراست، بەدەم هەموو هەنگاوو جێ پێیەکی نوێوە گەردو خۆڵێکی تازەیش بەرەو ـ کلاشو دەرەڵنگی شەرواڵەکەی دەهاتو وورد وورد کەڵەکە دەبوو . هەر لە جەمسەری رێگاکەیشەوە وەك گەلێك رۆژی تری پەستێورایە ناو جیهانە تایبەتیەکەیەوە . سەری دانەواند . نەی دەویست چاو لەئاستی ئەو ناسیاوانەیش هەڵبڕێت کە بەلایدا تێدەپەڕین ، کەسلاویان لێ دەکرد یان ناویان دەهێنا دەسلەمیەوە ، دەوەستاو پاش تێڕوانینیان زمانی دەکەوتە گۆ ، لە هەورازی بادگارەکانیدا بەرەو لێژی دەهاتو دیسان سەردەکەوتەوە ، دەمێك کرژو جارێك خاو دەی نواند ، زیاتر لەگاڵتەکەیەکی دەکرد لە هەورازێکەوە بەرت دابێتەوە ، چەند جارێك سەری پشتێنە کراوەکەی گرتو قەفێکی توندتری بەخۆیەوە ئالاند ، پەنجەکانی هەردوو دەستی لەدوای خۆیەوە لێك گیر کردبوونو لەنگەری لەشە کووڕەکەی پێدەگرت .

خۆری ئەو بەیانیە تیژبوو ، تا دەهات زیاتر ڕووی گوندو رێگاوبانی داخ دەکرد ، بەڵام نەگەرماو نەهاتو ـ چۆی زۆری رێگا نەیان دەتوانی رێچکە شکێنی لێکدانەوەکانی ـ خاڵە حەمە ـ بکەن . بەدەستە سڕەکەی ئارەقەی ناو چاوو سەرو ملی سڕی . هالاوی گەرمایەکەی ناو سنگو بەرۆکیشی بەرەو ژوور سەری دەکرد ، دلۆپە ئارەقەکان بوونە بروسکەیەکی بەتینو لە مێشکیان دایەوە :

[ ئێستا ئەویش ئارەقە هەموو لەشی داگرتووە . بەروپشتی چۆغە شینکیەکەی بۆر دەنوێنێت ، دلۆپ دلۆپ لەبرۆیەوە دەکەونە سەرپێلوی‌و لەوێوە دەڕژێنە ناوچاوی ، چاوە ڕەشەکانی سوور بوونو دەبرژێنەوە . ئەی ئەسپەکەی ؟ ئەوە هەر نەی‌کردبێت . تەواو شەلاڵی ئاردقە . لەیاڵو کەفەلیەوە بەرەو هەردوو دەستو قاچی چۆڕاوگەی بەستووە . هەورازەکەیش سەختو کووڕە ، ئێستا هەردوو کونە لووتی ئەسپە شێ لێك ڕەوبونەتەوە . کەف کەوتۆتە لالغاوەی . ئەبڕمێنێو بەتوولە ڕێی هەورازدا سەر دەکەوێت. بەڵام ـ جوامێر ـ سوارە . هەوراز زەفەری پێنابات . وەك ڕم لەسەر زینەکەی چەقیوە ، نە بەرەو خوار دێتو نە لارەی بەسەرەوە دەکات . دوای ماوەیەکی تریش] ..

سلاوو وەستانی لەپڕی ڕێبوارێك ڕەوتی ڕۆیشتنەکەی تێکدا . وەك لەخەوێکی خۆشت ڕاپەڕاندبێت بەسەرسامیەوە وەستا ، زۆر بەپەلە وەلامی دایەوەو کەوتەوە ڕێ .

[ .. ئەبێت لەبن دار بەڕووی سەر هەورازەکە کەمێك بحەسێتەوە ؟ نەء .. جوامێر پەلەیەتی . دەیەوێت زوو بگاتەوە ماڵ . بەڵام سێبەری دارەکە چڕو پڕە ، ڕەنگە پشوویەکی لەبندا بدات ، ـ جوامێر ـ ئەسپە شێ زۆر دەڕەتێنێت ، گەنجێکە شەیدای ڕێگاو ڕۆیشتنە. دەلێی ماسی ناو ئاوە ، ناوەستێت. ڕەنگە ئەسپە شێ گەلێك ماندوو بێت . زینەکەی لێدەکاتەوە . لغاوی لەسەر دائەماڵێتو ڕەشمەکەی دەکاتە مل ، دەیباتە سەرکانی ـ شۆخان ـ ی نزیك دارەکە . ناهێڵێت یەك ژەم دەم بە ئاوەکەوە بنێت . دەزانێت ژان دەکات ، بۆی دەکاتە تاو تاو ، خۆیشی چەند قومێك دەخواتەوەو چەند شلپێکیش دەدات بە دەمو چاویا ، پەنجە تەڕەکانیشی بە لاملو سنگو بەرۆکیا دەهێنێت . بەرەو دوا ـ دگەڕێتەوە ، ڕەشمەکەی هەر بەدەستەوەیە ، ئەسپەکە دوای دەکەوێتەوە ، دێنەوە بنداره‌کە ، پەرداخی دەکاتەوەو ، دیسان سوار دەبێت ، بە لێژیەکەدا بەرەو خوار دەبنەوە ، ـ جوامێر ـ هەر ڕمە چەقیوەکەی سەر زینە ، لارەی بۆ ناکات ، کە دەگاتە پێدەشت ئاوزەنگی تەقین لغاوی لێ توند دەکات ، سەرو

کلکی ئەسپەشێ وەك سوارەکەی ڕێك دەوەستن ، تۆ بڵێی
ــ جوامێر ــ ئاگای لە شیوەلۆکەکەی ــ چەقان ــ نەبێت ؟ یان
هەر بەغار بکەوێتە شیناوەردەکەی داوێن گوندەوە ؟ نەء ..
ــ جوامێر ــ پێ بەپێی ئەم ناوچەیە شارەزایە ، سوار چلی
ئەو درەختانەیش ئەناسێت کە بەژێریا تێدەپەڕێت ، هەرکە
زانی چلێك بەرەو ڕێگاکەی سەری کێشاوە هەر بەسواریەوە
ئەی چەمێنێتەوە ، یان ئەی بڕێت ...] .

جارێکیتر کەوتەوە ناو هەراو زەنای کۆمەڵێـك کوڕو
کاڵەوە ، گەیشتنە پاڵیو ماندوو نەبوونیان لێکرد ، چاوێکی
پیا گێران ، ئەوان تێپەڕین ، ئەم وەستا ، تەماشایەکی چیاکەی
ئەوبەری کرد ، لەبەر چاویا خاڵێکی ڕەشی پیا هەڵدەگەڕا ،
جار جار لە ناو ڕکەو ڕەوەزەکاندا گوم دەبوو ، پاشـــــان
دەردەکەوتەوە ، کە تەواو لە بەر چاوی لاچوو ســـــەری
داخستەوە ، کەوتەوە بڕینی ڕێگاکەی .

[ دەگاتە قەراخ ڕێ . بەلای مالی ــ ئەحـــەی خالیا ــ
تێدەپەڕێت ، لەپال حەسارەکەیاندا دەوەستێت ، خۆیو
سەرو ملی ئەسپەشێ لەو دیو دیوارەکەوە دیارن ، ماینەکەی
مالی خالی دەحیلێنێت ، ئەسپە شێ زیاتر گوێ قوت دەکات ،
دەکەوێتە سمکۆلو حیلاندن ــ نازە ــ ی خالی دەردەپەڕێت ،
ــ جوامێر ــ چوختیە ، تیلەی چـــاوی دەداتێو دەلێت :
( میوانی دووره ڕێ ڕادەگرن ؟ ) ــ نازە ــ یش هـــەر لـەو
سەرچاوەیە ئاوی خواردۆتەوە ، لەو کەمتر نازانێت ، پێی
دەلێت : ( بەمەرجێك بە هەموو شتێك قابل بێت ) .

لە مەشکەی سەر کونەلانەکە جامێك دۆی سارد دادەکات،
دەی خاتە سەر لەپی دەستیو هـــەر لەو دیو دیوارەکـەوە
جامەکەی بۆ درێژ دەکات، ــ جوامێر ــ خۆی لار دەکاتەوە،
بەدەستی ڕاستی جـامەکە دەگرێتو دەستی چەپیشی کەبـە
لغاوەکەوەیە دەی خاتە ژێر دەستی نازە، هێدی هێدی جامەکە
ڕادەکێشێتە سەر دەستی خۆی ، چاو لەچاوی دەبڕێو دۆکە
بەسەرەوە دەنێت ، نازە پێی دەلێت: (پەلە مەکە . ماندوویت،
ڕەوەت بەدواوە نیە ) ، ــ جوامێر ــ نۆرەی تیا دەکات ، کە لێ
دەبێتەوە هێشتا نیوەی جامەکە دۆیە ، ــ نازە ــ پاشماوەکەی
بە سەرەوە دەنێتو دوا قومی دەخواتەوە ، ــجوامێر ــ بـە
بزەیەك سوپاسی دەکات ، چەند کورتە هـــەوالێکی پەلەی
دەداتێو بەتاقە ڕێگا ســـــەرەکیەکەی ناودێدا بەرەو ژوور
دەبێتەوە ] .

لە دواوە بانگێك لە ــ خالە حەمە ــ کرا ، هەلوێستەیەکی
کرد ، پاشـــان سوپـــاسی ئاگاداریـــەکەی کـردو ، سەری
پشتێنەکەی کە بەسەر خۆلەکەدا دەخشاو ئەم ئاگای لێ برا
بوو هەلی گرتەوە ، دوو سێ جار دای بەدەستی ــ چەپیداو
تەکاندی ، ئەمجارە گەلێك توندتر بەخۆیەوە ئالاندو ســـەری
پشتێنەکەیشی وەك گرێ بەست . چاوی بـــەرەو گردەکەی
پێشی کە ڕێگای ئەمی تیا تەواو دەبوو هـــەلخست ، زانی
هێشتا نیوەی ڕێگای ماوە . خۆریش بەرەو ناوە ڕاســـتی
ئاسمان شالاوی دەهێناو گەرما تینی دەسەند . سروەیەکیش
گەلای دارێکی نە دەلەراندەوە ، جارێکی تر دەستە سڕەکەی
لەبەر باخەلی دەرهێنابەوە ، ناو چاوو لاملی سڕی ، گەیشتە
دوو ڕێیانەکە ، وەستا تا ئەو کیژەی لە ڕێگاکـەی تـرەوە
دەهات چەند هەنگاوێك لەم دوور بوو گەیشتە بەردەمی ، ئەم
زوو ناسیەوە ، لە گوندەکەی بەرانبەریانەوە بۆ لای ئـــەمان
دەچوو ، هەوالێکی گەرمی باوکی لێ پرســـی . پاشان پێی
ووت : ( باوکی تۆیش هەموو ڕۆژێك دەچێت بۆ لایدارا ؟ )
کچە سەرنجێکی سەیری لەخالە حەمەدا ، نەی توانی وەلامی
بداتەوە ، سەری داخستو بێدەنگ ملی ڕێگاکەی گرت .
ــ خالە حەمە ــ یش کەمێك بیری کردەوەو دیسان کەوتەوە
ڕێ :

[ ئەسپە شێ دەگاتەوە بەرمال ، حیلەیەك دەکات . وەك
مالو منداڵ لەوە بگەیەنێت کـــە بەسەلامەتی گەڕاوەتەوە .
ــئاسکەــ دەردەپەڕێت . هەر زوویش هاوار لە دایکی دەکات،
بەڕاکردن دەگاتە پێشیو لغاوەکەی لە دەست دەگرێت،جوامێر
دەستێکی دەخاتە سەرشانی ئاســــکەو پێ لـــە ئاوزەنگی
دەردێنێت ، لە پالیا دەوەستێت ، ئاسکە دەلێت : ( ئەسپە
شێ شەلالی ئارەقە . کاکە وابزانم بوارت نەداوەتێ . هەموو
ڕێگا هەر بەغار هاتوویت ! ) جوامێر پێی دەلێت : (زینەکەی
داماڵەو کاو جۆیەکی باشی بخە پێش . ئەم ڕازو گلەییانەیش
بخە دوایی .. دەی کچی قۆز .. ) . ئاسکە لەکاکی شارەزایە،
تاقە برایەتی ، نازی زۆرە ، کێ هەیە لەو ناو چەیەدا جوامێر
بناسێ و خۆشی نەوێت ! دایکی دەلێت : ( کوڕم مـــاندوو
نەبیت ، مالی خزمان چۆنن ؟ ) جوامێـــر وەلامی دەداتەوە :
( هەموو سلاویان هەیە ، چۆنت دیون هەروان . نەکـەس
خڕاوەتە گۆڕو نەکەسیش تازە لە دایك بووە .. بۆ نیوەڕۆیش
خواردنێکی باشـــمان بۆ بکە کوڕەکەت شـــەکەتی ڕێگایـەو
برسیەتی ] .

پۆلە کۆترێکی شینکە لەوەردی تەنیشت ڕێگاکە چینەیان
دەکرد ، سەرنجی دانێ ، بازێکیش بەسەر دار تووەکـــەی
بەرانبەریەوە هەلنیشتبوو ، زیاتر چاوی لـــەو بڕی ، وای
هەست کرد بازەکە زویرە چونکە تەنیایە ، بازەکە ملی بەلارەوە
نابوو بێدەنگ لەمی دەڕوانی ، بروسکەیەکی نوێ لە مێشکی
ــ خالە حەمە ــ ی دایەوە ، ئالۆزا ، زۆر ئالۆزا :

[ جوامێر جوامێر هەلۆ هەلۆ هەل هە .. ] .

دەستی بەسەر یەوە گرت ، وەستاو چاوەکانی لێك نان ، ویستی بە هێوری بکەوێتەوە سەر ڕایەلی یادگارەکانی ، هەنگاوی هەلهێنایەوە . بازەکە لە شەقەی بالی داوفری ، تاگوم بوو چاوی لێ نەتروکاند .

[ ئەو بەینە جوامێریش مات بوو . هیچی نەدەدرکاند ، ووتمان با ئازدت بۆ بخوازین . قایل نەبوو . ووتمان ئەی چیت لە دلدایە ؟ بێدەنگ بوو . بەلام لە چاوەکانیەوە هەست بە ئارەزوویەکی گەورە دەکرا . ئارەزوویەك لە شەپۆلی دەریـا بچێت .

— باوکە دەمەوێت بچمە چیای ئەفسون . ببمە هەلۆ ئەوانەی دەبنە هەلۆ خێرو خوشی ناوچەکەیان لەگەل خۆدێنن ستەم ریشەکێش دەکەنو زۆرداری ناهێلن .

— خەیالێکی ستەمە . ڕێگای چیای ئەفسوون سەختو دژوارە . کێ دەیگاتێ ؟ هەلۆیش چەندە سامدارە هێندەیش مەترسی لەسەرە .

— من لاوێکی بە توانام ، هاو دەمی چیای سەختم . تۆ پێت نە ووتم باپیرەم گەیشتۆتە ئەو چیایەو بۆتە هەلۆ . ئەی من لەو نیم :

— بەلام لای ئێمە ڕاوە هەلۆ دەکەن .

— ژیان ڕاوکردنو ڕاوکرانە . دەبمە هەلۆیەکی چنگ تیژ . ئەم سەرونەو سەری ئەم قەلەم ڕەوە لێك دەدەم . ئەوەی ڕاوی ڕەشە باو زریانیش دەکات دەبێ بزانێت ڕێگاکەی ئاسان نیە .

— تاقە کوڕمی . حەز لە شادیت دەکەم . نایشمەوێت ببیتە گۆزە شکاوێکی بنمال . بەلام چیا سەختە .

— ئەوەی دەبێتە هەلۆ هەمیشە بەسەر لووتکەوەیە لـە . هەموو دنیا دەڕوانێت . چیاو دەشتو نوالە نامێنێت نەبنە هاودلی . کام درەخت پەرداختە سێبەری بۆ دەکاتو کانیش ئاوی ساردو شیرینی دەداتێ . کێ لـە هەلۆ سەربەستترە ! ئەوی سەربەستیشی زیـاد بێت ئەرکیشی زیاد دەکات .

جوامێر سواری ئەسپە شێ بوو . دوو جار دەوری گوندی کرد . هاتەوە بەرمالێ . بزەیەکی بۆ دایکیو ئاسکەی خوشکی کرد . ئەوان بۆی کەوتنە پاڕانەوە . ئاوی ڕوونیـان بەدوادا ڕشت . جوامێر تاوی‌دا . بەناو دەشـتا بـەرەو چیـاو دوندولەندەکان تاوی‌دا . بەلام ڕێگای چیای ئەفسون تـەواو هەلەتو دژوارە . یەکجار دوورە . لانەی سەدان چانەوەرە ]

ـ خالە حەمە ـ رووی کردەوە چیاکەی بـەرانبەر ، ویستی هەموو تاوێرو بنچکێکی بە سەر بکاتەوە . بەلام چاوەکانی لێل بوون توانای ئەوەیان نەبوو لە هەورازی روانین بدەن، سەری دانەواندەوە . بەخۆی ووت : ( خۆلێش ڕەشە با ئەی وروژێنێت . هەلی دەگرێتو دەی بێژێتەوە . ئەگینا خۆی متو بێدەنگە . نەدەجوولێتو نە حەز بەڕاگوێزان دەکات ) .

## دەنگ

«ڕیگای چیای ئەفسوون تەلیسم بەندە . پێش ئەوەی بگەیتە دامێنی چیا دنیات لێ دەکاتە زریان ، بروسکەت بەسەرا دەبارێنێت . خۆت متکەو مەگەڕێ دواوە . کە خۆشی‌کرد سێ ڕێگات دێتە پێش.ئەبێت ڕێگای یەکەم بگریت.کەمێك دەڕۆیت. هەست بەگەرووی ووشکت دەکەیت. لە تینوانا هاکا خنکایت. کانیەکت دێتە پێش ، ئاوەکەی وەك چاوی قرژال پاكو ڕوونە. ئەی خۆیتەوە، ژەهری مارە . پیرەیەکت دێتـە سەرڕێ دەتلاوێنێت ، نەك . فریوی پێ بخۆی . دەگەیتە زەویەکی بەرین . دڕكو دالی تا ئەژنوت دێت ، وەکو خەنجەر لێت دەچەقێت. درەختێك لەسەر ڕێگایە . قەلە ڕەشـێك بەسـەریەوە هەلنیشتووە ، بەتیرێ بیخەرە خوارێ . خوێنی لەدەستو پێت بدە . دڕکەکان بۆت دەبنە لۆکە،هەنگاو هەلێنەو زوو بـڕۆ . قەلای یەکەم شێرێکی لەبەر دەمدایە . لێی مەترسە . دەست بەسەرو پشتیا بێنە . دەرگای قەلا دەترازێنێت . لە بەردەم قەلای دووەمدا پەتیارەیەکی زۆر گەورە ڕاوەستاوە . هیچ چەکێك کاری لێ ناکات . بیخافلێنە . دەرگای قەلا دانەخراوە. بچۆ ئەو دیو ، لە ناو قەفەزێکی هەلواسراودا تووتیەك زەق بچۆ ئەو دیو ، لەناو قەفەزێکی هەلواسراودا تووتێەك زەق زەق دەڕوانێت ، کە دەت بینێ هاوار دەکا . ئەوە گیـانی پەتیارەیـەزوو بیکوژە . دنیا دبێتە بـاو بۆران . کـە خۆش دەکات دەنگێك هاوارت لێ دەکات : ئەی ئادەمزاد چـەندە گەورەن هێندە نەگریـن . ئێوە خوێنە خۆری بـەکن . گەورەتان بچووك قووت ئەدا . سپیتان ڕەش دەکاتە شـێو هەموو بوونەتە دڕندەو یەك لەوی دیتان ڕادەکات . لـە بۆ چڕووکی سووتاوی لەشی ئێوە . فریشتەکان ! ـ زەفەس ـ و ـ ئاهورومزدا ـ هاتوونە تەنگ . ئەی ئادەمزاد : ببنـە باران . ببنە دەریا ، ببنە ـ ئەفرودیتـی خوا وەند ئەوەیش کە گەیشتە ئێرە دەبێتە پرد . مرۆڤەکانی خۆش دەوێت . ئەی گیانی پاك گیانی هەلۆ . هەلفرە بەسەر چیادا ، هەلفرە بەسەر دەریادا » .

خالە حەمە بۆ پشوویەك وەستا ، چاوی بـەدەوری خۆیدا گیرا . پاشان سەری بەردو ئاسـمان هـەلبڕی .

هەناسەیەکی قوولی هەلکێشاو کەوتەوە ڕێ .

[ سالێکی تەواو ڕابوورد ، لە نیوە شەوێکدا بووە ژاوە ژاو . پۆلە هەلۆیەك بەری ئاسمانی گوندیان تەنی . بالیان بەسەر بانەکاندا دەخشاند . چەند جارێك سەروبن گوندیان کرد . بەیانی زوو ــ نازە ــ هاتە مالێ‌و ووتی : ( مامە .. هەلۆیەکی کەلەگەتیان تیابوو . بالەکانی سپی‌و سەرو قاچی دەتگوت پشکۆی سوورن. بە تەنیا بەسەر حەسارەکەماندا هات‌و چۆی بوو . ئاوازێکی خۆشی دەخوێند . کە بۆ دواجار منی‌بینی بالە سپیەکانی بەسەرمدا هێنا . وەك پەنجە نەرمەکانی دایکم بوون کەپەلکیان بۆ دەهۆنیمەوە . من لەبەر دەستیا هێور بووم . هەستم بەشادیەکی بێ ئەندازە دەکرد کە وورد وورد دادەچۆڕایە ناو دەمارو دەروونمەوە . پاشان بالی پێك دادا . هەلۆکانی دی کەوتنە دوای . بەرز هەلفڕین . بەرزتر. تا گەیشتنە نزیك پەلە هەورە سپیەکان‌و ئیتر لە چاوم وون بوون ) ] .

دەنگ

« لە ناوچەدا .. پۆلە هەلۆ دەنگیان بەرزو بالی خۆیان کردە ئالا . لەهەر کوێ‌یەك دەنگی جوتیار بهاتایە . سرودیەك نووزەی هەژاری بهێنایە ، لە هەر کوێ‌یەك دەستی زۆر بکەوتایە گەڕ . پۆلە هەلۆ بەرەو ئەوێ ڕەختی خۆیان دەپێچاوە. بالی سپی دەبووە مەشخەل . پۆلە هەلۆی گەورەو مەزن . ئاسمانی ئەو هەرێمەیان چاك دەتەنی . خەوی خۆش‌بوون بۆ ناوچاوی هەژارەکان . ئاوازێکی یەزدانی بوون . هەمیشە دەوترانەوە . ناشتاین کولێرەی دەستی پوور مەنیجی هەتیو باربوو . شێویان ساوەری جوتیاری سەر خەرمان بوو . شەوی زستان بالیان ڕایەخی هەتیوی بێ باوك‌و . شەوی هاوین باوەشینی دەم‌و چاوە مێش لێ نیشتووەکانیان پێ دەکرد . بەلام ئەم هەلۆ سەیرانە . چەندە تووك نەرم‌و هێور بوون. هێندەیش سامیان بەستەلەکێکی مەزن بوو . پەنجەکانیان دەبوونە خەنجەرێکی تیژ . بۆ ئەوانەی دەیانەویست ڕێگا لەتیشکی خۆربگرن ، رووبارەکان ئاوارەکەن . وەکو زەروو بچنە خوێنی هەژاردوە . وەکوو دەمار بچنە لەشی زۆرداردوە » .

ــ خالە حەمە ــ گەیشتە دامێنی گردەکە . هەر لە یەکەم هەنگاوی نوێ‌یدا بەدەنگی بەرز سلاوێکی کرد . بێجگە لەبێ دەنگیەکی کڕ وەلام نەبوو . ــ خالە حەمە ــ گەلێك ماندو بوو . بۆ کەمە پشوویەك وەستایەوە ، چاوی بۆ کەوانەی گردەکە هەلخست ، کە چاوی بەدیمەنەکەوە ئالا هەناسەکەی هێندەی تر قورس بوو . سەری دانەواندەوە :

دەنگ

« لە هەرکوێ یەك ڕووناکی بوو تاریکیشی بەسەرا دێت. لەهەر کوێ زۆردارێك هەبوو چەوساوەکان لەوێ مۆلن. لەهەر جێ‌یەك گیانی بێ خەوش بێتە هەلۆ ، گیانی ڕژدیش هەر دەبێتە دەستی شەڕو بۆ سەرسنگ‌و بال‌و سەریان درێژ دەبێت . کەواتە هەلۆ چی لێ دێت ؟ » .

[ سەر لەبەیانی ڕۆژێکی بەهار بوو . هێشتا ئاورنگی شەو ئامێزی گەلای درەختەکانی بەر نەدابوو کە ــ نازە ــ گەیشت . ووتی : مامە دەلێن هەلۆ بالێکی شکاوە . لە گردی گولان کەوتووە . گوند خرۆشا .. ] .

خالە حەمە هەنگاوەکانی بەرەو سەروناو جار جار لەبێ لێنانی گۆڕەکان لا تراسکەی دەبەست . بەلام چاوی هەر لەوێ بوو .

[ هەلۆ هەر لەم شوێنەی ئێستایدا کەوتبوو . چاوە رەشەکانی لێك نابوون . پەڕێکی گەلێك سوور بەسەر سنگیا هاتبوە خوارێ . خالە سوورەکانیش بەسەر بالی سپیەوە ڕەنگێکی جوان‌و دلگیرتریان ئەنواند . دەستم خستە ژێر سەری‌و هاوارم لێ‌کرد . هەلۆ درەختێکی لەبن هەلکەنراو بوو . بەلق‌و پۆپ‌و قەدیەوە هێمن کەوتبوە سەر زەوی . هەلۆکانی تر بە سەرمانەوە دەگەڕان . ئەوی دەبوون. بۆ دواجار تەواو بەرەو زەوی بوونەوە . هەریەکەیان بالێکی بەسەر هەلۆدا هێنا .بلند بوونەوە. تا چوونەوە ناو پەلە هەورە سپیەکان‌و لەچاو وون بوون ] .

ــ خالە حەمە ــ گەیشتە سەر گۆڕەکە . سلاوێکی گەرمی لێ‌کرد . گەلێکیش ماندو بوو . لەپال کێلی لای سەریەوە دانیشت‌و هەردوو دەستی پێوەگرت . کەمێك مایەوە . پاشان هاتە تەنیشتی . هەندێك وورده بەردی لەسەر هەلچنی . سێبەری دار توودکە زیاتر لەشی حەساندەوە . سەری نایە سەر دلی گۆڕەکە . زۆر زوو خەوی لێ‌کەوت . لە خەویا هەلۆکەی لە جاران شکۆ دارتر بەسەر گردەکەوە وەستابوو . تەنیا هەلۆکەی ئەم پەڕە سوورەکەی سەرسنگی هەر دەشەکایەوە ، نازەو ئاسکەیش بوبوونە دوو هەلۆی بال سپی‌و پەلکیان بەر دابوەوە ، کە ئەمیان بینی سەری ڕێزیان بۆ دانەواند ، ئەم ویستی بیان‌گرێت . بەلام ئەوان زوو دایان لە شەقەی بال ، لەگەل هەزاران هەلۆی تردا کە تەواوی ئاسمانی ناوچەکەیان تەنی بوو جارێکی‌تر بەرەو پەلە هەورە سپیەکان ئاوابوونەوە .

# هەڵسەنگاندن

رؤوف عثمان

لە والاکردنو بەبالا برینی ئەم سی چیرۆکەدا هەوڵ ئەدەم مەسەلە تایبەتیو گرنگەکان بەئێوەی بەرێز بناسێنم ، چونکە ئەو دەرفەتە ئاوالەیەی کە من مەبەستمە بۆ هەڵسەنگاندنی چیرۆکەکان بەتەسەلی لەبارنییەو نارِسکێ ، سەبارەت بە پرۆگرامی لێکۆڵینەوەکەشم نەهاتووم کۆمەڵێ دەقی نێو سەرچاوە جودا جوداکان بێنمو بەزۆر بیسووم بەسەر کەسانو ڕووداوی چیرۆکەکاندا ، چونکە ئەم جۆرە ڕێبازە جگە لەوەی کە زۆربەی جارەکان دەبێتە هۆی وونکردنی کەسێتی ڕەخنەگر لەنێو ئەو ڕاو بۆچوونە جودایانەدا ، خۆ زۆر دەشبێتە هۆی وونکردنی ماف چیرۆکنووس یان هەر داهێنەرێك لەنێو ئەو دەقانەداو هەڕەمەییو میکانیکیەت ڕوانیش زاڵ دەبت ، لەلایەکی ترەوە لە دیدارێکی وەهاوا زۆربەی هەرە زۆری ئامادەبوان ئەدیبو رۆشنبیرو پسپۆڕی ئەو مەیدانەنو ئەوەندە پێویستیان بەو جۆرە دەقیزمیە نییەو ئاگاشیان لەزۆربەی ئەو سەرچاوەو دەقو کتێبانە هەیە ، هەر بۆیە بەگوێرەی ووزەو دەسەلاتی خۆم هەوڵم داوە لەخودی چیرۆکەکانەوە سەرنجەکانم هەڵبهێنجمو بە بابەتەکاندا بچمەوە ، خۆ ئەگەر جار نا جارێکیش بیرۆکەیەکی فەلسەفی یان تیوری سەری هەڵدا بێت ئەوە ئەنجامی موتالاو تاقیکردنەوەی ڕۆشنبیری خۆمە لەمەر سەرچاوەکانداو ئەو بیرۆکەیەش بۆتە بەشێك لە بنەمای بوونی ئەدەبیم .

لای من خوێنەری ووریا تەنیا هێزەو پێوانەی ڕاستەقینەش بیرو هۆشی میللەتە ، ئیتر ئەوانەی کە بەرز دەفڕنو پاساوی ئالۆشی خۆ بەزاڵ زانینو پێشر سەردەم کەوتن دەدەن بە دوا کەوتوویی و نەزانی میللەت ، هەر بەمردوویی دەمرنەوەو گۆڕەو شاری مێژوش دەدرێن .

● سەمای مەرگ لە ئاهەنگی شەوێکی ئەم شارەدا

لەگەڵ خوێندنەوەی شەش دێری یەکەمدا بەشێکی هەرەگەورە لە چیرۆکەکەدا خۆی دەدا بەدەستەوەو سەرەتا ی ڕووداوەکان دەکەوێتە دەستی خوێنەرەوە . دەشتوانم بڵێم ئەم شەش دێری یەکەمە یەکسانە بە $\frac{2}{3}$ چیرۆکەکەو پەرەگرافەکانی دوایش هەموو درێژەدانو تەفسیرو ڕوونکردنەوەی ئەو شەش دێرەنو ئەو زوو خۆبەدەستەوە دانە لەبواری کورتەچیرۆکدا بەسەرکەوتن دەشکێتەوە ئەگەر لەپەرپاسکەی چیرۆکەکەدا کۆمڵێك نهێنی پێچەڵپێچ شارابنەوە ، چونکە ئەو سەرەتایە دەبێتە موکنانیسو خوێنەر بەهەڵپەوە ڕادەکێشێو بەدەسەنە دەیگەیێنێتە ئەنجام ، بەلام ئەگەر ڕووداوەکانی دوایی کەمتربنو لەجوغزێکی تەسکدا خۆیان شاردبێتەوە ئەوا مەسەلەکە بەبارێکی دەرونی و هونەری پێچەوانەدا دەشکێتەوە .

(دایکی ئازاد ئافرەتێکی کەڵەگەتی لەشپڕی گەنمڕەنگبوو ، تەمەنی 35 ساڵ دەبوو ، دووچاوی گەشی ڕەش ، پرچێکی درێژ بەشانو ملیا هاتبووە خوارێ ، کە پێدەکەنی ڕوومەتەکانی چاڵ دەبوو ئەمە ئەوەندەی تر جوانی کردبوو) ئەم وەسفی چیرۆك نووسە بزواندنی هەستی سیکسو دامرکاندنەوەی ئالۆشەکانی لەش لەبیری خوێنەردا دەبزوێنێ نەك بەزەییوسۆز بەرامبەر بە ئافرەتێکی مێردو ڕۆڵە کوژراو .

ئەم ئافرەتە لە گێژاوێکی دەروونی ناهەمواردا دەخولێتەرە . دوو هێزی کاریگەر هەریەك بەلایەکدا ڕای دەکێشن . بۆیە دوچاری خۆکروشتنو کینگڵدانو سەر سوڕهاتن هاتووە . هێزی یەکەم داوای داماڵینی سیپاڵی ڕەشو سیمای تازێ باریو خەم خواردنو کوژاندنەوەی یادگارەکانی ئازادو باوکێتی. هێزی یەکەم داوای بەردانی پوورە هەنگی تامەزرۆیی سێکسو دامراندنەوەی ئالۆشو ئارایشتی خەستو خۆڵو چوون بۆ قەیەریو هاتنە بەر دەرگا دەکان . بەلام هێزی دووەم داوای تازێ باریو ڕەشپۆشیو بیرکردنەوەی سەروبر لەباوکی ئازادو یادگارە دێرەینەکانیان . دەکات هێزی دووەم داوای لەبیرنەکردنی کوژرانی تەراژیدی ئازادو باوکێتی .

دەرئەنجام بەپێی وەسفو بابەتی چیرۆکەکە هێزی یەکەم

زاڵتردو پاش سێ هەفتەو دەرۆژ واتە ۳۱ ڕۆژ بەشێوەیەك ناسرا کە بریگادێر بنرێت بەکولکیەوە . تەنانەت ئەوەی کە ئەم زاڵێتی یە دەسەلمێنێ ناوزڕانو مقۆمقۆی گەڕەكو دەسنیشان کردنێتی لەلایەن یەکێ لەپیاوەکانی بریگادێرەوە . هەرچی هێزی دووەمە هەرماوە بەڵام لەشێوەیەکی نیمچە پشتگوێ خراودا . یان بابڵێین وەك ژیلمەمۆی ژێر خۆڵەمێش وایەو بەتەمای شەماڵێکە .

ئێستا باوڕێ بەلای شەخسی دووەمی چیرۆکەکەدا دەدەینەوە . بریگادێرێکی چاوبرسی یەو حەیشۆی لێ هەڵساوە. بەئالۆشەوشەرواڵ پلیتە . جێگای ڕووداوەکەش گەڕەکی هۆلێی سولەیمانی یەو کەسەکانی لەو دەورووبەرەدا هەناسە دەدەن . ئەمبریگادێرە وەك هەر داگیرکەرێ بەخەیاڵی خاوی ئابڕوی شارەکە لەپۆستاڵەکانیا یەتی و هەموو ئافرەتەکانیش جاریەو بێخاوەنن . بۆنا ؟! عەرشو قورش لەژێر دەستیا دەناڵێنێ . پاداشتی مێشك پژاندنی هەر لاوێك دانیشتنی شەوێکیەتی یان ئافەرینێکی فەرماندەکەیەتی . سەرباری ئەمانەیش ئەوەندە چاووڕوو قایمە بلوكو کوڕێکی کوشتووە کەچی هاتووە ئابڕووی خاوەن خوێن بتکێنێ .

منی خوێنەری ئەم چیرۆکە ئەوەم بەخەیاڵدا نەهاتووە کە ئەم ئافرەتە دەبێتە خاوەنی ئەو هەڵوێستە مەزنە . چونکە هەڵسو کەوتو شۆڕەتو شێوەی مامەڵەکردنی ئەوەی لێ نەشیاوەتەوە . دایکی ئازاد لە چەند ساتێکی کەمداو لەئەنجامی بیرکەوتنەوەی یادگارەکانی ئازادی کوڕیا دیوی ناوەوەی هاتۆتە سوێو نەتوانێ مەیلی بنێ . دڵی کەوتۆتە پڵدان . خوێنی ئازاد بەردەرگای بەدڵی گرتووە ( انا ) کەی زیندوو بۆتەوەو ئەو فەرمانە مەزنەی پێ سپاردووە ئەو هەڵوێستە ئیجابی و پیرۆزەی پاڵەوانی چیرۆکەکەمان جۆرێکە لەزیندوو بوونەوەی ویژدانو خۆ پاك کردنەوەی دەروونی . بەڵام بەڕێگای تاكدا . ئەم جۆرە بیروڕایە لەبنەوانا دەگەڕێتەوە بۆ مەسیحیەتو وەك بەرهەمی ئەدەبیش لەسەردەستی تۆلستۆیدا گەشەی سەند. ڕۆمانی ( البعث )ی تۆلستوی باشترین نموونەی ئەو پاك بوونەوەیەیە . بەڵام یەکێ لەمەترسی یەکانی ئەم ڕێبازە چارەسەرکردنی کێشەکانە بەڕێگای تاكدا . مەیاندنی جۆرە گۆشەگیری و دوورە پەرێزیەکیشە هەروەها دوورخستنەوەی دەوری کۆمەڵکاری یە ( الجماعية ) لە دروستکردنی مێژوو ڕووداوە مەزنەکاندا .

بەهەرحاڵ ئەوە بەشێکە لەئازارو دەردەسەری و پاڵەوانێتیو چەوساونەوەی فرەلایەنی ئافرەتانی لای ئێمە . جاران خازێی بلەو ئافرەتانی دمدمی موستەفا سالح کەریمو گردی شەهیدانی موحەرەمو چاڵی جەرگی پیرێژنی حوسێن عارفو دەیەهای تربوون ، بەڵام ئێستا هەر مەپرسن چونکە حاڵەکە ئێجگار ناحاڵە ، بەڵێ ئێستا زۆربەی بووکە شەنگو باڵا نەجیەیەکان بوونەتە بێوەژنی لانە وێرانو ئاوارە . لەجیاتی ئارایشتی خەستو خۆڵ جێ چرنووكو ڕومەت ڕنینەوە دەمووچاوی کردوونەتە کۆلوی ڕەش . ئەو مەمکە خڕو پڕ چنگانەی کە ئیلهامی گۆرانو وەفایی بوون ئێستاکە پووکاونەتەوەو ڕەشن

بەهەر حاڵ لەگەڕەکی هۆلێی ڕەشە خەڵكو قەسابەکانی سولەیمانیدا ئافرەتێکی ڕوو بازاڕیو گومان لێکراوی بێ دەرەتان ناوەوەی زیندوو دەبێتەوەو کارێکی مەزن دەکاتو ئێمەی خوێنەریش دەستی بۆ بەسنگەوە دەگرین . حەز دەکەم دەستی ئەم پرسیارەیشم بمەیێ بە ئەلقەرێزی دڵی کاك عەبدوللاوە . بۆ پاڵەوانەکەی کچێکی قوتابی ڕۆشنبیر نەبوو ؟ چونکە ئەمەیان گونجاو ترە لەگەڵ سەرجەمی ڕووواوەکاندا.

با ئەوەش لەیاد نەکەین لە بەقەد ڕوباری دەربڕینی سۆزو خۆشەویستیو هەستی بەزەیی و فرمێسك هەڵڕشتنی بەرامبەر بەزامدارێ . بەقەد نەشتەری ئەو پزیشکە سوودبەخش نیە کە ئەوەندەی تر زامەکەی ئەدێرێتەوەو دەیهێنێتە سوێ .

**چیرۆك نووس لە والا کردنو دەربڕینی سیفاتو کەسانی ناو چیرۆکەکەدا تووشی چەند غەفلەتێکی هونەری وورد بووەو لەوانەیە خوێنەری ئاسایی و سەرپێی پوان بەزوویی دەرکی پێ نەکات ، منیش وەك دڵسۆزو ڕاستگۆی مەڕ کارەکەیو جێ متمانەو بڕوای خودی نووسەریش بەگوێرەی تواناو ووزەی خۆم لەپ دەخەمە سەر شتەکانو والای دەکەم .**

۱ ــ لە وەسفی ئەم بریگادێرەدا کاك عەبدوللا دەڵێت : « لە ئینگلیز نەدەچوو . صەلیبێکی ئالتوونی لەملدا بوو » . بێگومان بریگادێر پلەو نیشانی سوپای خوێن خۆری زایۆنیزمەو نەدەبوو صەلیبی لەملدا بێتو ئەستێرەکەی داوود شیاوتر بوو . لەم ئاقارەشدا دیاردە ئاینی یەکان قەدەغەنو لەریزی بریگادیرەکاندا نابێت ڕەنگ بدەنەوە . دوای ئەوە ئەم بریگادێرە لە ئینگلیز بچێ یان نا . هیچ لەکارەکە ناگۆڕێو ئیتر چیرۆك نووس بۆ بلێ لە ئینگلیز نەدەچوو ؟! .

۲ ــ چۆن لە کاتێکی ناسکی وەك پێك گەیشتنی بریگادێرو ئافرەتێکی شۆخداو لەنیوەشەو و لە هۆدەیەکی تەنیاشدا ، بریگادێر پرسیارێکی دەبەنگانەی وادەکات کەڕابواردنو ئالۆشی دامراندنەوەکەی لەکیس بچێو دایکی ئازاد لەخۆی شێت کاتو بڵێ ( بەڕاست نازانی کێ کوڕەکەتی کوشتووە ) . خۆ ئەگەر چیرۆکنووس بۆ ئەوەیەتی کەهەڵوێستی ڕق لەدڵی دایکی ئازاددا دروست کاتو لەو ڕێگایەوە تەورەکە بوەشێنێ . ئەوا ئەو ڕستەیە سیمای دانشینو سەپاندنی بەئاشکرا تێدا دەردەکەوێت . بەهەرحاڵ گەلێ ڕێگای هونەری تر هەبوو بۆ دروست کردنی ئەو مەناخە . هەر بۆ نموونەش ئەگەر بریگادێر بیووتایە لەمەودا هەموو شتێکت بۆ دەستەبەر دەکەم هەرلە نەوتو ئاردوو هەموو ئازووقەیەکەوە ئیتردوە دایکی ئازاد یادگارەکانی زیندوو بوایەتەوەو لەدڵی خویدا بیوونایە ئەگەر ئازادو باوکیت نەکوشتایە بوونی ئەمانە ئاسایی دەبوونو ئینجا

پشکۆی ڕقەکەی گەش بوایەتەوە .

٣ ــ لەکاتی پێك گەشتنی بریگادیرو دایکی ئازاددا ، بریگادیر پیتەر داوای شەربەت دەکاو شەویش هێندە درەنگە دووجار کەلەشێرەکەی ئەوبەریان خوێندوێتی یان بابلێین دەمەو بەیانە ، بەلام دایکی ئازاد لەم کاتەداو لەدلی خوێدا دەلێت ( خۆشەکری کلۆشمان هەیەو بۆ دیشێکی بۆ نەبەم )، وادەزانم چای دیشلەمەو شەکری کلۆو لەدەمی بەیانداو بۆ بریگادێر پیتەرێك کە ئامشۆی لەندەن بکات نەساچاوە، تەنانەت ئەگەر شەکرە کلۆکەش ژەهری تێدا بێتەو دایکی ئازاد بیەوی دەرمانخواردی کات هەر بەرێگای دیشلەمەدا نەگونجاوەو شەربەتەکە لەبارترە .

٤ ــ کاك عەبدوللا دەلێت : ( دایکی ئازاد مێخەك بەندەکەی ملی پچراندەوە ، پیتەریش گورج بێریەکەی سەری داگرتەو بەرداخەکەی سوك لەسەر زەویەکە داناو بەچیچکانەوە دەستی کرد بەچنینەوەی موورو گولنکە مێخەك ) .

ئەوەی کە ڕوونە مێخەك بەند پێك هاتووە لە دوو بەش یەکێکیان زەنگیانە یان موورووو یان مرواریەو لەشێوەی گۆپکەیەکدا دروست کراوەو هۆنراوەتەوە ، ئینجا بەهەمان کشتەك لکێنراوە بەمێخەکە هۆنراوەکانەوە الەهەمان شێوەی گۆپکەدا و بەوشێوەیە یەك لەدوای یەك ، کەواتە بەشە مێخەکەکەی قوبەی پێ دەلێن نەك گولنکە : هەروەها بچراندنەوەکەی دەبێتە هۆی پەرت بوونی گۆپکەیەك مووروو گوپکەیەك مێخەك واتە ( قۆبەیەك ) نەك زۆر . ئەگەر کاك عەبدوللا لە جیاتی مێخەكبەند ملوانکەیەکی مرواری بنووسیایە باشتر دەبوو .

یەکێ لەمەیدانە گرنکەکانی ڕەخنە بەراوردو پێوانەیە ( المقارنە والقیاس ) بەلام لەبەرکەی دەرفەت ناتوانم ئەم دوولایەنە فەراهەم بهێنم ، لەمەڕ بابەتی ئەم چیرۆکەی کاك عەبدوللادا دووکورتە چیرۆکم خوێندۆتەوە یەکێکیان بەناوی ( تۆلە سەندنەوە ) کە بلە نووسیویەتیو لەگۆڤاری رزگاری ژمارە ( ١٦ ) دا بلاوکراوەتەوە ، ئەم چیرۆکە لەسەدا نەوەد ڕووداوو بابەتەکەی لەوەی کاك عەبدوللاوە نزیکە ئەم چیرۆکە بەشیکە الەخەباتی شۆڕشگێڕانەی گەلی کورسێکا دژی داگیرکەرە فەڕەنسیەکان ، پالەوانەکەی کچێکی شوخە بەناوی ( پۆلین )ەوە کە کاپتان مۆریسی تاوانبار دەکوژێ ئەوەندە هەیە ئەم کچە سەر بەپارتێکی شۆڕشگێڕو خاوەن ئایدۆلۆجیای پیشکەتنە خوازەو ئەمەش خالێکی ڕووناکەو جیاوازیتە لەکردەوە تاکرەوەکەی دایکی آزاد ، بەلام چیرۆکەکەی تری مەڕ ئەم مەیدانە بەناوی نابەزێزێن ( لا یقهرون ) کە سومرست مۆم نووسیویەتیو لە گۆڤاری ( الثقافة الاجنبیة )ی ژمارە ( ٤ ) سالی ١٩٨١ دا بلاوکراوتەوە ، هەر چەندە ئەم چیرۆکە وەك ( تۆلە سەندن ) لەمەوە نزیك نییە ، بەلام هەر لەسەر هەمان ولیەل تەونی بۆ کراوە بەدارا ، دەبێت ئەوەش بزانرێت کە مەبەستم لەدەست نیشان کردنی ئەم دوو چیرۆکە ئەوەنییە کە گوایا خوا نەخواستە کاك عەبدوللا سوودی لەمانە وەرگرتووە بەلکو ناسینی پلەی داهێنانو دەست پێشکەریو ئیزافەو وون نەکردنی مافی هەر داهێنەرێکە .

سەبارەت بەگرنگی مەسەلەی زمانو چۆنیەتی بەکارهێنانی ووشەو رستەو بابەتە ڕەوانبێژیەکان ناتوانین بەقەد تۆسقالێك چی‌یە پشت‌گوێ یان خەین ، چونکە شێوەی نووسین ڕەنگدانەوەی کەسێتی هونەری نووسەرەکەیە ، ئەگەر ئایدیاو ناوەرۆك دەست نیشانی پایەی سەرکەوتنی ئەدیب بکەن لەمەڕ بابەتە ئەدەبی‌یەکاندا،ئەوا شێوەو زمانو جوانکاریە هونەرەیەکان نەك بەتەنیا ئەو سەرکەوتنە دەمەێننو بنج بەستی دەکەن بەلکو دەبنە هۆی دەربڕینی ئەو ئایدیایانەو ئەو ئایدیایانەش بێ ئەمان نارسکیی ، زمانی نووسین بریتی‌یە الە کەسێتی هونەریو زەوقو پێناسەی نووسەر ، تەنانەت زۆر کەڕەت نووسەرێك بەشێوەی دارشتنو هۆکانی دەربڕیندا دەناسرێتەوەو ئەمەش قۆناخێکی پێشکەوتووی مەڕ ئەو نووسەرەیە ، لەبەر ڕۆشنایی مەڕ ئەو ڕاستی‌یانەدا بەهەندێ مەسەلەی زمانەوانی چیرۆکەکەی کاك عەبدوللادا دەچمەوە بەمەبەستی چارەسەر کردنی چەند ڕستەو دەستەواژەیەك .

١ ــ کە پێدەکەنی ڕوومەتەکانی چالّ دەبوو . ڕاستتر وابوو بینووسیایە دەبوون .

٢ ــ لەشوێنێکی تردا دەلێت ( لە دالانەکە پەرداخێ شەربەتی برد ) یان ئەوەتا پاشگری ( دا ) دابنێو بلێ لەدالانەکەدا . . یان ئەوەتا بلێ لە دالانەکەوە پەرداخێ شەربەتی برد .

٣ ــ چیرۆکنووس دەلێت : لەوێدا ژنە هەاوێستەیەکی لەناکاوی بۆکرد و خەندەی چاوەڕوانی بەڕوی پیتردا هەلدەدا. ڕاستتر وابوو بیووتایە هەلدا ، چونکە دوو کرداری دژ یەك خزاونەتە یەك ڕستەوە . لەسەرەتاوە دەلێت ( بۆکرد ) کەرابووردووە ، لەکۆتاشیدا دەلێت ( هەلدەدا ) کە بۆ داهاتووە .

**■ مەلەکان بەرەو کوێستان نەگەڕێنەوە ■**

چیرۆکەکەی کاك موستەفا صالح کەریم بەم گفتو گۆیە دەست پێدەکات

ــ بۆکەمێك نانووی ؟ تۆ دوێنێ شەویش نەنوستی ، ئاگادارت بووم تا بەرەبەیان هەر چلەی چاووتدا !

ــ خەوم لێ ناکەوێ

ــ هەوڵ بدە

ئەو حالەتە دەروونیەی خەولێنەکەوتووەکە ئێجگار نائاسایەو هەست بە ئازارێکی گەورەی دەکرێتو خوێنەریش بەهەلپەوە بەدوای هۆی نەخەوتندا دەگەڕێ ، شرێتی بیرمان

دەخەینە گەڕو هەزارو یەك حیسابی بۆ دەکەین ، خۆ پەرەگرافەکەی دوایش کە دەڵێت ( بەڵام سەر لەنوێ زامەکانی لەشی دەمیان کردەوە وەك بەمەست خۆیان تی بکرێ کەوتنە کزانەوە ، وای هەست ئەکرد گیانی خەریکە شەقار شەقار ئەبێ ، هەر ئەوە نەبوو گوێی لەدەنگی لەتو پەت کردنەکەی نەبوو ) ئەوەندەی تر مێشکی خوێنەر دێنێتە گیرو گێژ ، دوای ئەم پشووە بێ ئەنجامو بەدوادا گەڕانە بێ هوودەیە ووردە ووردە شەماڵی چەند سۆراخێك هەڵ دەکاتو کامێرای چاووم دەچێتە سەر ژوورێکی ساردو سڕی نیوە ناتەواوی میوانخانەیەکی ئەو شارەی کەپاڵەوانی چیرۆکەکە تێیدا گیرساوەتەوە ، لەنێوان ئەو گێڕانانەوەی دوای ئەو پەرەگرافە بەڕێکای تەداعی دا دەست دەخەینە سەر چەند زانیاری‌یەکی ترو هێدی هێدی دیمەنەکان واڵا دەبن .

پاڵەوانی چیرۆکەکە مرۆڤێکی نەقڵ کراوەو لەیەکێ لەشارەکانی سەر ڕوباری فوراتدا گیرساوەتەوە ، نەك هەر خۆی بەڵکو چەند هاوڕێ‌یەکی تریشی ، تەنانەت ڕۆشنبیریشەو سەر مێزەکەشی چەند کتێبێکی الەسەر کەڵەکە کراوە ، هەتا ئەم سنوورە کلیلی ڕووداوە سەرەکی‌یەکە لەگێرفانی چیرۆك نووسدایە ، پاش چەند ڕستەیەك سەرەداو دەکەوێتە دەسمان و تێ دەگەین کە کوڕی پاڵەوانەکەمان قوتابی‌یەو خزێنراوەتە کونجی بەندیخانەوەو ئەمە لەدوایدا بەبروسکەیەك دەردەکەوێت .

بێگومان ئەم هەواڵە دڵتەزێنە مێشك کرۆژو کینگل پێدەرە بەجۆرێك ئۆقرەی الێ‌دەبڕێ کە بەعەردو بەردەوە سەوزنابێ ، بۆیە پاڵەوانی چیرۆکەکە دەخاتە گێژاوێکی واوە کە ئەگەر نەچێتە دەرەوەی میوانخانەکە لەوانەیە ئەوەندەی.تر خەفەی ئازار ببێ ، لەژوور دەر دەچێو دەکەوێتە ڕێ پێوانی شارو ئارامی الێ‌هەڵئە گیریو خۆشی نازانێ ڕووەوکوێ دەچێو چی دەکات، کاك موستەفا بەم ڕێکەیەدا وێنەیەکی فوتوگرافیانەی شارەکەی بەتەواوی بۆکێشاوینو تەنانەت پتر لە (١٥٠)دانە ووشەی کردۆتە ئازوقەی ئەم وەسفە . لێرەدا ناچارم وێستەیەك بکەمو بزانم تاچەند ئەم دووسەد ووشەیە زەمینەیان خۆشکردووە بۆ بەرزبوونەوەو پێکەیاندنو کارتێکردنی ڕووداوەکان .

**مەودای کورتە چیرۆك تەمەن کورتەو پێویستی بەخەستو خۆڵیو گرژ ی ووشەو دەستەواژە هەیە ، دەبێت ڕستەو ووشەکان حیسابێکی هەندەسی ئەوتۆیان بۆ بکرێتکە کونبڕ بن ، هەتا دەتوانرێت دەست بەووشەوە بگیرێتو بەهەر چوار لا نەدرێ بەبادا ، تەنانەت مێشکی نووسەری ئەم بابەتە گرنگە وەك کۆمپیوتەرێ گەرەکیە چەندێتیو چۆنێتی ڕستەکان دابەش کات بەسەر ئەو ڕووداو و کاتو جێگاو کەسانەدا ، هەر یەك بەرێژەی خۆی ، بەهەر حاڵ ئەگەر ( ٣/٢ ) ئەو دووسەد ووشەیە لابرێ دارو باری چیرۆکەکە وەك ڕووداو ناگۆڕێو بە پێوە دەمێنێتەوە .**

لای منی خوێنەر تەنیا مەبەستی چیرۆکنووس وێنەکێشانی خەمناکی پاڵەوانەکەی نی‌یە کە لەئەنجامی گیرانی کوڕەکەیدا هاتۆتە گۆڕێ ، بەڵکوو باسی خودی خۆشیەتی کە لەو غەریبی‌یەدا دووچاری ئەو ئازارە بووە ، ( لەکاتی لەدایك بوونی دلێرا لەسەفەر بووم ، کە هاتمەوە زەوی لەخۆشیدا نەی ئەگرتمە خۆیێ ،لەشاتەوە ئیتر خۆم الەوا ئەبینمەوە ، هەموو خۆشی دنیام بەو دابوو ، هەرچی ئاواتێك لەژیانما لێی بێ بەری بوبووم ، ئەمەویست بۆ ئەوی بهێنمە دی ، ئەم زانی یەکەم هەنگاو لەمەدا یەك ئەگرینەوە من دەست بەسەرو ئەویش گیراوو بەند کراو )" .

واتە لەژێر خەمی دوو جۆر چورتمو نەهامەتیدا دەناڵێنێ، یەکێکیان غەریبایەتیو ئەوی تریش گیرانی دلێر ، لەوانەیە خوێنەری ئاسایی گیرانی دلێر بە ڕووداوی یەکەم بزانێو ئەوی دیش بە پەراوێز ئاسا ، بەڵام لای من وەك کارێکی هونەری یەك تەواوکەری ئەوی ترە ، وەك زانیاری‌یەکی بیرکاریو ژمارە « الریاضیات » ، دابەش بوونی ووزەی هونەری چیرۆك نووس بەسەر ئەو دوو مەبەستەدا بۆتە هۆی سستی تەوژمی هەردووکیان ، خۆ ئەگەر زیاتر پێی لەسەر مەبەستێکیان دابگرتایە ئەوا ووزەی داهێنانەکەی بەر لایەك دەکەوتو ئەو لایەنەش باشتر دەرەخساو خوڕو کاریگەر تریش دەبوو .

بەسەرە داوی تەداعیدا ئەوەش دەزانین کە باوکی دلێر کاتی خۆی لاوێکی بزێو بووەو سەری لەم شتانە خوراوەو بابزانین دەڵێ چی : ( دیارە ووشەکانی باوکم ڕاست بوون کە هەموو جارێ پێی ئەووتم ڕۆڵە ڕەحمێ بەحاڵی من بکە، کەوابێ ناهەقی نەبوو .

ـ منال پارچە یەکە لەجگەری مرۆڤو یەکجار شیرینە) لێرەدا لێك‌چواندنو تەنانەت یەکسانی ڕووداوەکانی سەردەمی لاوێتی پاڵەوانەکمانو ئێستای دلێری کوڕی بەرزەقی دەردەکەوێت ، هەرچەندە وەك ڕاستی‌یەکی فەلسەفی نابێ مێژوو ڕووداوەکانی خۆی بگێرێتەوە ( التاریخ یعید نفسه ) چونکە هەنگاوەکانی مێژوو هەردەم لەپێشکەوتنو جووڵانو گوڕو تین دایەو هەرگیز ڕوداوەکانیش وەك خۆیان دووپات نابنەوە .

خۆ ئەگەر ببنەوە ـ کەناش‌بنەوە ـ ئەوا لەچوار چێوەی کاتو جێگاو دارو باری نوێدا دەبن . ڕەحم پێ‌کردنی دلێر بە فەرهادی بلوکی بەلکەی قایل بوونو ملدانی هەردووکیانە بەناتەواوێکان ، باوکێکی غەریبی خەمی ئێمە لەکۆڵ هەڵگر کە

لە ( ژیانیا شەرابی ئەشکەنجەی نۆشیبێ )و داوای ئەو جۆرە ڕەحمە لە کوڕەکەی بکا ، بەڵگەی خاوبوونەوەو پاشە کشەیەتی، بەهەر حاڵ من نامەوێت پاڵەوانە کە دڵی پل نەدات بۆ دڵێری کوڕیو سۆزی باوکێتی بخاتە لاوەو تەنانەت ئەشکری ئەمانە هەموو ئاساینی لەبەردەم سۆزی باوکدا بەرامبەر بە کوڕەکەی ، خۆ ناشمەوێت باوکە بکەمە سوپەرمانیکی بەراز دڵی بێ سۆزو خۆشەویستی ، بەڵام لەهەمان کاتدا ناشمەوێت داوای ئەو جۆرە ڕەحمە لەدڵێری کوڕی بکات چونکە ئەو جۆرە ڕەحمە دەرگای ملدانو دووڕە پەرێزی و دەست بەکڵاوەوە گرتن دەخاتە سەرپشت ، ئا ئەم داوایەچیرۆکنووس لەگەڵ دارو باری خودی چیرۆکەکەو پاڵەوانەکەیدا ناگونجێت.

چیرۆکنووس لە دەربڕینی سۆزی تایبەتی باوکایەتیدا دەسەڵاتێکی هونەرمەندانەی کۆکی هەیەو وەستایانە چارەسەری دەکات هەندێ لەدیمەنەکان دەقۆزێتەوەو دەیانخاتە ژێر ڕکێفی خزمەتی مەبەستەکە یەوە هەر بۆنموونە ( لەنێوان شیش بەندە ئاسنینەکانەوە سەیری ڕوبارەکەی ئەکرد شیشەکان لەبەرچاوی ئەبوون بەقەفەزی گەورەو دەستو پەنجەی ناسکی چەندانی وەك دڵێر لەنێوان شیشەکانەوە دەر ئەکەوتن ) ، لەشوێنیکی تردا بەهەمان شێوەی کلرامانە دیمەنە ئاڵۆزاوەکانی ئەو شارەی سەر فورات دەبەستێتەوە بەبلرە دەروونییەکەی خۆیەوەو هۆشیارانە لەتەلی مەبەست دەداو لەپ دەخاتە سەر زام .

چیرۆکنووس لە لەقتەیەکی تردا زیاتر پێ لەسەر غەریبی یەکەی دادەگرێ، ئەلهاو سۆزی لای سەروو دەکات (هەرچەندە سەرەتای وەرزی بەهار بوو ، بەڵام هێشتا کزەیەکی ساردی هەر هەبوو چاوی بڕییە ئاوەکە ڕەنگی لێڵبوو ، ئاوی باراناوی سەرەوەی لەگەڵ خۆیا هێنابوو ) بەلی لێلی ئاوەکە فرمێسکی چاوی ئەو گەواڵە هەورانەیە کە بەخوڕ دانەکەنە سەر وەردو ڕەوەزی وشكو چیاودوندی ئزر ، خۆ خێوەکانیش ناهێڵن بە تەنیا دڵۆپێك چییە قورگیان تەڕکەن ، چۆن وانی یە ؟! وەرد بێگاسنو کەژ بێهۆرەو کارێز ووشك هەڵاتووە !

شاپەڕی ئەم لەقتانە ئەو منالەیە کە دەبێتە هاورێی پاڵەوانی چیرۆکەکەو لەرێکایەوە چەند سەرەتاوێکی نوێ دەدۆز نەوە ، ئەم منالە هلوزمانی پاڵەوانی چیرۆکەکەیەو خۆ دیاریشە چ دەردە سەریەك گەیاندوێتیە ئەوغەریبییە ، تەنانەت لەوانەکنیا باشیش نییە ، نەك لەبەر ئەوەی کەکەودەنە بەلکو لەبەر ئەوەی کە بەزمانی خۆی ناخوێنێ ئەم ئاوڕدانەوەیە زیرەکی چیرۆك نووس دەردەخات کەچۆن بەتەنیا ڕستەیەکی چکۆلانە لەدەرگای مەسەلەیەکی گەورەی داوە ، ئەم منالە واتە ئەردەلان هاڕمونیای سەبووریو ئاسوودەیەکی دەروونی سەیری بەخشیوە بە پاڵەوانەکەو تەنانەت بۆنی دڵێری کوڕی ئاوە بەوەوە ، هەروەها ڕستەکەی دایکی ئەرسەلان کە دەڵێت ( ئێوارە وەختە گوێ ئاو باشنییەو خێوی هەیە ) کراوەتە پردێکو پاڵەوانی چیرۆکەکە ئلزارو ئازارو ئەشکەنجەکانی دڵێری بەسەرا پەڕاندۆتەوە خانەکانی مێشکەوە .

وەك دەرکەوت کاك موستەفا بۆ مەیاندنی بیری چیرۆکەکەی پەنای بردۆتە بەر شێوەیەك لە شێوەکانی تەداعی لەبۆتەی لەقتەی سینەما ئاساداو ئەم لەقتانە هەر یەك بەمەبەستێك جۆرە سۆزو بیریك لەدڵی خوێنەردا دەوروژێنن ئەمە لەکاتێکدا کە سەرجەم ئەم لەقتانە بریتینین لەڕووداوێکی هەرەم ئاسای درامی ، واتە سەرەوە بنیات نرابێ لەسەر چینەکانی خوارەوەو ئەگەر چینە خشتێ لەبینا هەرەمییەکە لابەین ئەوانی تر ئێتك بترازینو پەرت بن ، واتە توخمەکانی سەرەتاو پێکەشتنو کوتەو پڕیو کۆتایی لەم جۆرە چیرۆکانەدا ئەوەندە بایەخیان پێ نادرێ، هەر بۆنموونە ئەگەر ئەو چوار لەقتەیە پاشو پێش بخەین ، یان یەك دوویەکیان لابەرین ئەبعادەکانی چیرۆکەکە ناگوڕێن ، ئەم جۆرە چیرۆکە زیاتر لە ئاوو هەوای بەرهەمە سینەمایەکانا هەناسەدەداتو پتریش ئاسۆ فراوانتر دەکات لەبەردەم چیرۆکنووسدا کەشتی گەورە و دوورە دەست بلێو لەهەمان کاتیشدا پێویستی بەبیریەتی لێکدانو ترازاندنو ساچاندنی وورد هەیە ، چاوخشانێك بەهەندێ لەچیرۆکەکانی یوسف السباعیدا زیاتر هونەری ئەم جۆرە چیرۆکە لەبەردەممانا ئاواڵە دەکات .

سەبارەت بەمەسەلە زمانەوانییەکانی نێو چیرۆکەکەو هەموو بەرهەمێکی تری ئەدەبی ، هەتا ووشەو ڕستەو دەستەواژەکان سفتو گرێچنیو حسابی هەندەسی ووردیان بۆکرابێت ئەوا زیاتر دەتوانن بیرو سۆزو ڕاچەنینی گەورەو داڵۆڤان بگرنخۆ چونکە زمانیش یاسای تایبەتی خۆی هەیەو ناکرێت نکوڵی لێبکرێت ، هەروەك دەشزانین کاك موستەفا تاقیکردنەوەیەکی دوورو درێژی هەیە لەڕێڕەوی ئەدەبو ڕۆژنامەگەری کوردیدا بەڵام وەك ڕاستییەکی زانستی هەموو تاقیکردنەوەیە چوون یەك نییەو ئەم چەند تیبنییە زمانەوانیە هەیەو هیوادارم مەبەستم پێکابێ .

**١ ـ پاشگری ( دا ) لە زۆربەی کاتەکاندا لەدوای ( لە ) وە دێتو کاك موستەفا ئەم ( دا ) یەی بواردووە لەڕستەی ( لەم غەریبیە هەر ئەوەم کەم بوو ) دەبێت بووترێت ( لەم غەریبییەدا ) .**

**٢ ـ بۆ ( عەلاگە ) جلهەڵگری داناوە بەڵام دەمێکە مەولەویو وەلی دیوانەو وەفایی چلاك یان چلۆلەیان بەکارهێناوەو ئەم ووشەیە ڕەسەنترە .**

**٣ ـ کە ساڵی پار گوزەرانیان تیاکردو لەدوایشا ئەوەشیان.**

**ڕاستتر وابوو بیووتایە لەدوایبدا ، چونکە ئەو پیتی ( شینە ) فەرمانەکەی بەستنەوەی شتەکانی پێشەوەیە بەدواوەو بەدوادا هاتنی ئەم دوو پیتە لەدوو ووشەدا ناگونجێت .**

**٤ ـ هەرچی ئاواتێك لەژیانما لیێ بێ بەری بووبووم ئەمەوسیت بۆ ئەوی بهێنمەدی بریا بیووتایە ئەمەوسیت .**

**٥ ـ ئوتومبیلێکی سوپایی بەلایا تێپەڕی،ئێریەلە دریژەکەی ئەشەکایەوە ، بریا بیووتایە ئەلەرایەوە چونکە شەکانەوە بۆ بەرۆو چادرو بابەتێکە کەتۆزێك پان بێتو لەئەرێلدا نایەتەدی.**

### هەلۆ لەزریانی درنجەکاندا

بابەتی ئەم چیرۆکەی کاك رەووف بێگەرد چوونە ناو جیهانێکی پڕ لەکێشەو چەرمەسەریە ، خالە حەمەیەکی کلاش خوار و ستەم دیدەی ئەم وولاتی بەفرو خوێنە ، لەگەل هەلهاتنی خۆردا بەرێگای هەورازو پڕ نشێوی ناوچەیەکی ڕكدا بەتاسەوە مل دەنێ ، نەك ڕووەو ئاستانەی حەوانەوەو پشوودانو بەختیاری ! بەلکوو ڕوەو ئەو مەزارە خەمناکەی کە ئارامگای تەرمە لەخوێنا ڕەق هەلاتووەکانی دەیەها هەلۆی وەك جوامێری کوڕیەتی ئەم خالە حەمەیە وەك هەر مرۆڤێ دەشێت خاوەنی کۆمەلێ موعاناتی تایبەتی خۆی بێت بەلام زاڵترینو بەسوێترین بیرەوەری لای ئەم تۆڕ بوونەوەیەتی بەئاخی ئەو ڕوودلوو کاتو دیمەنانەی کە جوامێر هەناسەیان تێدا دەداتو یادگارە خۆشەکانی ڕەنگی تێدا دەداتەوە تەنانەت ئەو ملەو دەربەندو ئەسپەو ڕەومزانەش هەر بەشێکن لە یادەکانی جوامێرو بەوەوە گرێدراونو دەورێکی بنەڕەتی گرنگیش دەبینن لە بەرز کردنەوەی توخمی درامای ڕووداوەکەدا ، چونکە وەك زانستییەکی سەلماو مرۆڤ تەواوکەری سروشتەو مرۆڤی بێخاكو سروشتیش مەگەر هەر الە فەرهەنگی راوە هەلوکەراندا بێ ، بابەتی چیرۆکەکە بەتەنیا لەسەر ئەم ڕایەلە تەونی نەخستۆتەگەڕ ، بەلکو هەندێ مەسەلەی فیکریشی جوولاندووەو دواجاریش دەگەڕێمەوە سەر ئەم لایەنە گرنگە چونکە لای من ناوەرۆك داینەمۆی هەموو بەرهەمێکی ئەدەبییەو سەرکەوتنی بەرهەمە ئەدەبییەکان لە ئایدیاوە دەست پێدەکاتو ئینجا مەسەلە هونەریو تکنیکیەکان دێنە گۆڕێ ، تەنانەت لایەنە مەعریفیەتەکەی ئەدەبیش هەر لەناوەرۆکەوە دەست پێدەکات ، هەر ناوەرۆکە تواله جۆگەی بیرو ڕۆشنبیریو ڕێنومایو خەملاندنی هەلوێستی مرۆڤانەو داکۆکی کردن لەڕاستی دەڕژێنێتە خانەکانی مێشکی خوێنەرەوە ، خۆ ئەو سەردەمە تایبەتیو دەگمەنانەی کە ناوەرۆكو شێوە لێك دەترازێنو بەهێلێکی هاو تەریبدا ناڕۆنو بۆشایی دەکەوێتە نێوانیانەوە بەلگەی یان لێرەبوونەوەی

ئەو گومەلگایەیە بۆ چالی دواکەوتنو سەرنگوون بوون . یان سەرەتاو لەسفرەوە دەست پێکردن .

کات لە چیرۆکی ( هەلۆ )دا بریتییە لە چاو شارکێیەکی هونەری ڕووداوەکان یان با بلێین چەند وێنەیەکی جودا جودا لەنێوان ئێستاو ڕابووردوودا ، زاڵبوونی چیرۆك نووس بەسەر کێشەی نێوان کاتەکانداو خستنە ژێر ڕکێفی ئەبعادەکانی لە خزمەتی پێکەیاندنی ڕووداو ئەنجامەکاندا کارێکی وەها ئاسان نییەو هەرچەندە لێرەدا کاك رەووف بەسەرکەوتوویی ئەم تاقیکردنەوەیەی بڕیوە ، بەلام زۆر چیرۆك نووسی دووچاری غەفلەت کردووە . ئێستا وەك کاتی ناو چیرۆکەکە خالە حەمەیەکی شەکەتو جەرگ بەساجا دراوو سلەماوەی مەڕ تاقیکردنەوە تالەکانە ، ئێستا هەورازو پێوان و گوێ نەدانە خەلكو ماندوێتی ڕێگای مەزارە خەمناکەیە ، ئێستا گەڕانە بەدوای سەبوریو خلمۆش بوونەوەیەکی ئەفسوونایو هیچیکە ، ئێستا لەسەرجەمی چیرۆکەکەدا چەند ساتێك یان با بلێین نێوەرۆژێکە ، بەلام نەك لەدۆخێکی وەستاوی وەڕس کەردا ، بەلکو خۆی لەخۆیدا چەند ساتێکی بزێوی ئەوتۆیە کە زۆربەی ڕووداوو کەسەکانی چیرۆکەکە دەدات بەتەنافی ڕابووردوودا ، ئێستا لەدیوی دەرەوەی چیرۆکەکەدا دەرگایەکی سەر کلۆمەو چاوەڕێی دەستی داهاتووە یان با بلێین بنەمای داهاتووە ، سەرجەم ڕووداوەکانی ئێستای چیرۆکەکە لەشێوەی گێڕانەوە ( السرد )دا فەراهەم هێنراوەو پالەوانەکەشی کە خالە حەمەیە کەسی سێیەمە .

بەلام ڕابووردوو وەك ئێستای نێو چیرۆکەکە تەمەن کورتنی یەو گەلێك لەنیو ڕۆژ پترەو هەربۆیە زۆربەی چیرۆکەکەی بۆ تەرخان کراوەو موعادەلەکە بەلای ڕابووردودا لاسەنگ بووە ، ڕابوردوی نێو چیرۆکەکە چەند دیمەنێکی بێڕتووشی ئاوایێو قەدپالو دەشتی هەتەرو دوندو ڕەوەزەکانە ، ئەسپەشێو ئاوزەنگی و سواری وەك ڕم چەقیوی جوامێرە ، ڕابووردوو ختووکەی دلداریو سوارچاکیو کەژ پێوانی ڕەهەندانەی جوامێرە ، تەنانەت جوامێریش وەك زاراوە ناوێك لە جوامێریدا سەرلێوە ، سەرجەم ڕووداوەکانی ڕابوردوش لە بازنەی گێڕانەوە ( سرد ) دەرچووەو خۆی هاویشتۆتە نێو تەداعیو گەڕانەوەو شەپۆلەکانی هۆشی کەسی سێیەمەوە بەلام ڕابووردوو بەوەستاوی نامێنێتەوەو لە مێشکی خوێنەردا وەك موگناتیسێك داوای ئاززووقەی گەشەکردنو ئەنجام دەکات ، لەناکاوا هەروەك کوتو پڕی نێو چیرکە کلاسیکییەکان بوعدێکی نوێ چەکەرەکە دەکات ، ئەم بوعدە نوێیە بەخێرایی هێند گەورە دەبێت هەتا جلەوی هەموو ڕووداوو کەسەکانو تەنانەت مێشکی خوێنەریش بەلای خۆیدا ڕادەکێشێتو دواجاریش دەبێتە هەسوونە قایمەی ڕووداوەکە ، چیرۆكنووس وەستایانە لەڕێگای پیشاندانی دیمەنی چەند پەلەو ڕێکدا ئەم

گۆڕانکاری‌یە چۆنیەتی‌یەی فەراهەم هێناوە ( پۆلە کۆترێکی شینکە الەوەردی تەنیشت ڕێگاکە چینەیان دەکرد ، سەرنجی دانێ ، بازێکیش بەسەر دار تووەکەی بەرانبەریەوە هەڵنشتبوو زیاتر چاوی لەو بڕی وای هەست کرد بازەکە زویرە ، چونکە تەنیایە بازەکە ملی بەلارەوە نابوو بێدەنگ لەمی دەڕوانی بروسکەیەکی نوێ لەمێشکی خالە حەمەی دایەوە ، ئالۆزا زۆر ئالۆزا : [ جوامێر جوامێر هەڵۆ هەڵۆ هەڵ .. ] بەڵێ

جوامێری سوار

چاك و دڵدارو زرنگ دەبێتە هەڵۆی چیاو خەمی هەرێمەکە دەدات بەکوڵیا ، میلی کاتەکانی نێو چیرۆکەکەش بەخێرایی خول دەخوا ، بەڵی [ ئەو بەینە جوامێریش ماتبوو هیچی نەدەدرکاند ، ووتمان بانازەت بۆ بخوازین قایل نەبوو ، وتمان ئەی چیت لەدڵدایە بێدەنگ‌بوو ، بەڵام لەچاوەکانیەوە هەست بەئارەزویەکی گەورە دەکرا ئارەزویەك لەشەپۆلی دەریا بچێت] ــ بلوکە دەمەوێت بچمە چیای ئەفسوون ببمە هەڵۆ ئەوانەی دەبنە هەڵۆ خێرو خۆشی ناوچەکەیان لەگەڵ خۆ دێنن ، ستەم ڕیشەکێش دەکەن و زۆرداری ناهێڵن ] .. من لاوێکی بەتوانام هاودەمی چیای سەختم ، تۆ پێت نەووتم باپیرەم گەیشتۆتە ئەو چیایەو بۆتە هەڵۆ ، ئەی من الەو نیم . ــ بەڵام لای ئێمە ڕاوە هەڵۆ دەکەن ــ ژیان ڕاوکردن‌و ڕاوکرانە . ئەم بوون بەهەڵۆیەی جوامێر هەرچەندە پیرۆزە بەڵام کوت‌و پڕو زەمینەی بۆ خۆش نەکراوە ، وەك بەجێهێنانی چەند فەرمانێکی پیرۆز، یان بۆرە پەیوەندیەك بەڕێکخراوێکەوە یان هەڵگڕان بەڕووی هەندێ ناتەواوی ئەم کۆمەڵگایەی کە هەردەم باشترین هێلانە هەڵۆ بووە ، سۆپەرمانێتی تاك لەگۆڕانکاریە مێژوویە مەزنەکانی ئەم جیهانەدا دەبێت بەچین‌و تاقمە کۆمەڵاتیەکانەوە ببەسرێتەوە سۆپەرمانێتی دابڕاو لەڕێك خستن‌و پێشڕەوایەتی مێژوویداو لەکۆمەڵگای دەرەبەگی‌و نیمچە دەرەبەگیدا کوت‌و تەوقێکەو تەنانەت کراوەتە ملی هەندێ تاقم‌و کۆمەڵە سیاسی‌یەکانەوەو تووشی گەلێك نووچدان‌و چورتمی کردوون.

هەروەها هەڵۆ ڕەفزی جووت بوونیش دەکات لەگەڵ نازەی خالیدا چونکە فەرمانیکی پیرۆزی لە ئەستۆ گرتووە ، ئەمەش بەشێکە لەڕەنگدانەوەی سۆپەرمانێکەی چونکە خۆشەویستی خاك بەشێکە لەخۆشەویستی مرۆڤەکانی ئەوخاکە ، تەنانەت عەبدوڵلا بەگی گۆران لەشێوەنی هەڵۆ بەگدا ئەو بیرە تەنگە بەرانەی ڕەتکردۆتەوە کە دڵداری‌و ئەرکە مەزنەکان دابڕ دەکەن‌و لەمێژووی ئەدەب‌و سیاسەتیشدا گەلێك نموونەی ئەم ئەشکەنجەو بێوەژن کۆشی ئافرەتە خێر لەخۆ نەدیوەکان‌و هاوبەشی کردنی مەردانەیان لەگۆڕینی واقیعدا گەواهی ڕاکە من .

ئەوەی کەووتم سەرجەمی ئەبعادی کاتەکانی ئێستاو ڕابوردوو بوو لەچیرۆکەکەی کاك رەوو فدا بەهەموو ڕووداوو دیمەن‌و کەسەکانی‌یەوە ، تۆ بڵێی داهاتوو وەك بوعدی سێهەم بێ بەرایی بێ‌و منی خوێنەریش لەدووڕێیانی ئێستاو ڕابوردودا بچەقم‌و میلی کارتێکردنی چیرۆکەکەش لە مێشکدا بوەستێ ؟ ! ئەمەیان ئێجگار گرنگە لەمەیدانی ڕەخنەداو چارەنووسی چیرۆکەکە ڕەنگ دەڕێژی ، لای من ئێستاو ڕابوردووی نێو چیرۆکەکە دەبنە گاسنێکی تیژ و بەوەردی یادگارەکاندا دەچنەوەو تەراژیدیای مێژووی قۆناخێکی پڕشکۆی ئەم هەرێمە دەلێنەوە ، ئێستاو ڕابوردووی نێو چیرۆکەکە دوو جۆر کانی لەدڵی خوێنەردا دەتەقێننەوە یەکێکیان هەموو دلۆپەکانی دەبنە ڕقێکی پیرۆزو ئەوانە دەسووتێنن کە ڕاوە هەڵۆ

**دەکەن‌و نەشتەری ژەنگاوی دەژەننە دلە گەورەکەی مێژوو ؛ جەرگی سەدەهای وەك خالە حەمەو ئاسکەو نازە دەدەن بەچلاکی خەمدا ، بەلام کانییەکەی تر هەموو دلۆپەکانی دەبنە خۆشەوسیتیو پڕیز لەبەردەم ئەو هەڵۆیانەدا کە کەم دەژین و کەڵ دەژین ، ئەو هەڵۆیانەی کە نەبەتەمای چلەی ماتەمین‌و لافیتەی پرسە لێکردن‌و نەمریی درۆینەن، گەرەکیانە بەئیك‌و پروسکی شەکەت‌و خێر لەخۆنەدیوەکانیان بەسکی برسیو خەوی هەمیشە تۆراو گیانێکی نوێ بڕەنە بەر ڕەزو کێلگە ڕەنگ پەڕیوەکان ، نەخشەیەکی ئەرخەوانی لەم ئۆقیانووسی مەرگەساتەدا ڕەنگ بڕێژن‌و ، بەم شێوەیە تیوری پاککردنەوە (التطهیر) ئەرەستۆ لەبەرهەمەکەدا ڕەنگی داوەتەوە ، لەبواری ئەدەبدا بەرهەمێك پاککردنەوە دێنێتە گۆڕێ کەتیشکی ڕاستەقینەی هونەری بخاتە سەر کارەساتە تەراژیدییە جگەربڕەکان‌و لەنێوانیەوە سۆزی سەبووری و بەزەیو خۆشویستنی ڕۆمانسیانەی بێگەرد بنەخشێنێ.گەوهەری تەراژیدیا بریتییە لەبەیەکدانی ختووکەی دڵ‌و خولیاو ئارەزوو لەگەڵ مەبەستە ئەخلاقیو کۆمەلایەتیەکاندا ، جوامێر نەك بەتەنیا دەست دەنێت بەگەرمترین ئارەزووەکانی دڵیەوە کە نازەی خالیتی بەڵکو بەچارەنووسی ژیانیشیاو ئەورێگایە دەگریتە بەر کە لەپێناویا سەر دەنێتەوە ، ئێمە لەژیانی ڕۆژانەماندا گەلێ مرۆڤی ناپەسەند دەبینین کە لەپێناوی پایەو سامان‌و دزیو شەروال پیسیدا خوێنیان دەڕژێو ترۆ دەکرێن و تووشی سزادەبن ، بەلام بەقەد تۆسقالێ خەمیان بۆ ناخۆین .**

**کەواتە هەموو ئەنجامێکی ناخۆشو ~~مۆتێ~~ ڕژانێك تەراژیدیا یی یەو توخمی پاککردنەوەش (التطهیر) ناهێنێتە گۆڕێ ، ئێمە لەتوێشووی دڵماندا خەمی مرۆڤێ هەڵدەگرین کە وەك جوامێر**

وێلی بەدیهێنانی ئاواتە گەورەکان بێت نەك بەتەنیا لەسەر حیسابی دەمکوت کردنی هیوا تاقە کەسێکانی بەلکو لەسەر کوژانەوەی چرای ژیانیشی ، ئالێرەدا بەزەقی گرێدانی لایەنی تەراژیدیو پاك بوونەوەکە دەردەکەون لەنێوان ئەم ڕووداوە مێژوو مەشرەبەدا . چۆنیەتی واهێنانیش لەم جۆرە بابەتانەدا بەندە بەئاستی چیروکنوسەوە کە تاچەند لەووزەیدایە شتە تایبەتیو هونەریو زەوقێکانی موتوربەکان لەزەمینەی بیری خوێنەردا ، لەچیرۆکەکەی کاك ڕەووفدا توخمی چیرۆك وەك هونەرێکی خاوەن پێناسەو چوار چێوەی تایبەتی ڕەنگدانەوەیەکی ژاکاوو کالتری هەیە لەدەرکەوتنی خودی خۆیدا وەك بیرو ڕاو هەلوێست ، واتە کەسێتی خۆی زالترەو درەوشاوە تریشەو دەشێت ئەمە بەخالێکی لیجابی دانەنرێت .

**مەسەلەی ستاتیك لەچیرۆکەکەدا وەك دیاردەکی داهێنان‌دێتە ئاراوەو گەرەکە دەست نیشانی لایەنەکانی بکرێت . ستاتیك وەك بابەتێکی داهێنان بەشێکە لە هۆشیاری کۆمەلایەتیو ئەمیش ڕەنگدانەوەی پەیوەندیە ئابووریەکانی نێو کۆمەلەو لەکۆمەلگای فرەچیندا وەك .**

حەتمیەتێکی زانستانە دەبێتە دیاردەیەکی ڕێژەیی و نیسبی.دیارە ئەم نیسبییەتەش لای مرۆڤی هوشیار نابێ ببێتە وونکرونی توخمە سەرەکیەکانی لەگێژاوی روشنبیری باودا (الثقافة السائدة) لەچیرۆکەکەدا کێشەکان لێك دەترازێن و دەچنە چەند جوغزێکی جودا جوداوەو دواجاریشی بەهەموویان بیری سەرەکی چیرۆکەکە دەخەملێنن ، کێشەی نێوان خالە حەمەو جوامێری کوڕیو دواجاریشی سەرکەوتن یئرادەی جوامێر ، خالە حەمە ڕەمزی ڕاوحکردن و دەست بەکلاوی خۆوە گرتن و چاوەنواڕی بێهودە و چرا کوژاوەی هیوای دوا ڕۆژە بەلام جولێر ڕەمزی ئازایەتیو نەبەردیو ملنەدان و هێنانەدی ژیانێکی پڕ زەردە خەنەو فەرە دیارە سەرکەوتنی بەرەی خێرلەم کێشە لاوەکییەی ناو چیرۆکەکەدا هێنانەدی دیاردەیەکی ستانیکیانەی گەشە لەئاسۆی بیری چیرۆك نووسدا ، لەلایەکی ترەوە کێشەی گرتنە ئەستوێ فەرمانە مەزنەکان لەنێوان تاك و کۆمەلدا ، بەلای لایەنە باشەکەدا کەوتۆتەوە ، لەسەرەتادا تاقە سوار هەر جوامێرەو جوامێر بەلام لەدوا ییدا ئەم بەرەیە فراوان دەبێو سەدەها هەلۆ بال دەخشێنن بەزەویداو ئەمەشیان هەر خالێکی ئیجابی ترە .

دەمێنێتەوە ئەوسێ دەنگەی کە لەچیرۆکەکەدا دەزرنگێنەوە ، ئەم دەنگانە جگە لەبەشە ئەفسانە بیەکە تەواوی بیرو ڕاو فەلسەفەو بۆچوونی کاك ڕەوفەو گوشراوەتە نێو چیرۆکەکەوە . و توانیویەتی مەناخی تەراژیدیای چیرۆکەکە لەبارکات ، هەر چەندە نیوەی دەنگی یەکەم بەشێکە لە ئەفسانەی میللیو حیکایەتی شەوانی گوێ ئاگروان و ناوەرۆکەکەشی بریتیە لەکێشە سەرەتاییەکانی نێوان سروشت و مرۆڤ ، بەلام شتەکانی تریش لای من بەم جۆرە دەکەونەوە، نیوەی دووەمی دەنگەکەکە دەلێت کاك ڕەوف خۆیەتی : (ئەی ئادەمزاد چەندە گەورەن هێندە نەگریسن ، ئێوە خوێنە خۆری یەکن ، گەورەتان بچووك قووت ئەدا سپیتان ڕەش دەکاتە شێو ، هەموو بوونەتە دڕندەو یەك لەوی دیتان ڕادەکان لەبۆ چڕوکی سووتاوی لەشی ئێوە زەفەسڕو ئامورامـوزدا ـ هاتوونەتە بەرهەم) هیمای تێکرا ڕوانین و ناتایبەتیێ پێوە دیارەو دەچێتە بازنەی ڕۆمانتیکیەکانەوە. ئەم قوتابخانەیە پێ لەسەر ڕێزی مرۆڤ و قوولکرونەوەی گیانی مرۆڤایەتییە لەنێو هەموو چینەکانی میللەتدا ، ئادەمیزاد هەر ئادەمزادەو مسەلەی چینایەتی و چەوساوەو چەوسێنەرو خوێنەخۆیو خوێن‌خۆراو دیاردەیەکی عەرەزی ناگرنگەو بەرهەمەکانی ئەلفرید دی موسیەو فکتور هوگوو بایرون نموونەی ئەم میدانەن ، بەلام لەراستیدا مێژوو بریتییە لەکێشەی نێوان چەوساوەو چەوسێنەر ، هەموو کردەوەکانی بەرەی چەوسێنەر لەئادەمیزادی دەرچوونەو جەکارهێنانی هەموو ئامێرێکی نامرۆڤایەتییە بۆ سەرکوت کردنی زەحمەت کێشەکان ، تەنانەت وەك بەلگەیەکی زیندووشی ڕێژەی هەلۆکانی ئەمعەشق وگرە لەسەدا نەوەدو پتریشی سەر بەچین و تاقمە زەحمەتکێشە کانن ، کەچی لەهەمان کاتدا ئادەمیزادە دەولەمەندو بۆرجواکانی هەمان هەرێمی بەدبەخت نەك سامان و پایە کوێری کردوون بەتەنیا بەلکوو بوونەتە بزمارێکی ژەنگاوی ژێر پێلاویش .

بەلام دەنگەکانی‌تر بەرچاو ڕوونیو ڕاستگۆییو لەپە خستنە سەر زامێکی ئەوتۆیە کەچیرۆکەکەی گەیاندۆتە چلە پۆپە بەهەردوو بارەکەیدا چ شێوەو چ ناوەرۆك تەنانەت تۆزە بەراوردێك لەنێوان ئەم دەنگانەو دەنگی چیرۆکی ئەفسانەی ڕێی هات و نەهاتی مەڕ موراد گوڕانکاری یەکی چونیەتی گەش

دەردەخات لەبیری کاك رەووفداو هەروەها ئاسۆیەکی گەشتریشی لەبەردەمیا دەکاتەوە ، چونکە ئەمری ئەدەب بەندە بەرادەی ئەوبیرو هەستو سۆزە دوورە دەستو دەگمەنانەی کەدەری دەبڕێ ، هەتا ئازاری زەحمەت کێشەکان بکاتە زادو خەونەکانیان بکاتە دەستە گوڵو گیانی نەبەزین بمەێنێ ئەوەندە پیرۆزە ، هەر بۆسەلماندنی ئەم ڕایە بابزانین یەکێ لەدەنگەکان چیمان فێر دەکا (لەهەر کوێ یەك ڕوناکی بوو تاریکیشی بەسەرا دێت لەهەر کوێ زۆرداریێك هەبوو چەوساوەکان لەوێ مۆڵن ، لەهەر جێیەك گیانی بێخەوش بێتە هەڵۆ گیانی ڕژدیش هەر دەبێتە دەستی شەڕو بۆسەر سنگو باڵو سەریان درێژ دەبێت) دوا هەنگاوە شەکەتەکانی خاڵە حەمەی ماندوو چەماوەی باری خەم لەبەردەم گوڵ کۆی جوامێری کوڕیا بەم شێوە تراژیدیە گیرسایەوە (خاڵە حەمە گەیشتە سەر گۆڕەکە ، سڵاوێکی گەرمی لێکرد ، گەلێکیش ماندوو بوو لەپاڵ کێلی لای سەریەوە دانیشتو هەردوو دەستی پێوە گرت ، کەمێك مایەوە ، پاشان هاتە تەنیشتی ، هەندێك وردە بەردی لەسەر هەڵچنی سێبەری دارتووەکە زیاتر لەشی حەساندەوە ، سەری نایە سەر دڵی گۆڕەکە زۆر زوو خەوی لێکەوت ، لەخەویا هەڵۆکەی لەجاران شکۆدار تر بەسەر گردەکەوە وەستابوو پەڕە سوورەکەی سەر سنگی هەر دەشەکایەوە.نازەو ئاسکەیشی بو بوونە دوو هەڵۆی باڵ سپیو پەلکیان بەڕابۆوە ، کە ئەمیان بینی سەری ڕێزیان بۆ دانەواند ئەم ویستی بیان گرێت بەڵام ئەوان زوو دایان لەشەقەی باڵ ، لەگەڵ هەزاران هەڵۆی تردا کە تەواوی ئاسمانی ناوچەکەیان تەنی بوو ، جارێکیتر بەرەو پەڵە هەورە سپیە کان ئاوابوونەوە) .

سەبارەت بەشێوەی داڕشتن لام وابێت کاك رەووف دەسەڵاتێکی باشی هەبێت بەسەر زماندا ، لەسەر جەمی بەرهەمەکانیدا هەست بەسفتو سوڵی ڕستەکانو حیساب بوکردنێکی هەندەسی ورد دەکەین ، ئەمڕۆ ئەرکی ئەدیبی کورد بەتەنیا گوێانە بابەت نیە بەڵکو گوێدانە زمانو یاساکانی ڕێزمانو بژاندنی سەلیقەی زمانا پاراویە ، زمانی کوردیشی ئەوەندە خزمەت نەکراوە هەتا پالی لێدەینەوە ، هەتا ئێستاش کۆمەڵێ کێشەی زمانەوانیو ڕێنووسو بابەتی گەورە بەخاوی ماوەتەوە .

# پاڵەوانو رووداو لە چیرۆکی کوردیدا

■ حەمە سەعید حەسەن ■

**ئیتماتۆف لە سەگی بەڵەکدا ئەوەندە شارەزایانە باسی دەریاو هەموو ئەو شتانەی پەیوەندییان بە دەریاوە هەیە ئەکا، خوێنەر لەرێی ئەو چیرۆکەوە کۆمەڵێ زانیاری پوخت دەربارەی نهێنییەکانی دەریا فێر ئەبێت . کە گۆرکی دوژمنەکانی نووسی پلیخانۆف ناچار بوو بڵێ : ( کۆمەڵناسە هەرە مەزنو شارەزاکان ئەوانەی لە دەریای زانستا مەلە ئەکەن لەگۆرکییەوە زۆر شت فێر ئەبن )(١) ، رۆمانی بیرەوەرییەکانی مالی مردووانی دەستۆفسکی بووە هۆی قەدەغە کردنی ئەو جۆرە ئازاردانە سەختەی لەهەموو زیندانەکانی ئەو سەردەمەدا باو بوو، هێشووەکانی تووڕەیی جۆن شتاینباك هەوێنی گۆڕینی چەند بڕگەیەك بوو لەیاسای ئەمەریکایی . جاك لەندەن لە پاژنە ئاسنینەکاندا لەرێی پاڵەوانەکەیەوە ئایدۆلۆژیای کرێکاران ئەخاتە روو ، محەمەد زەفزاف لە هەوڵی ژیاندا رووناکی ئەخاتە سەر هەموو ناکۆکییەکانی کۆمەڵگای مەغریب لەسایەی دەسەڵاتی ئیمپریالیزمدا، چیرۆکی شاعیرە شێتەکە(٢) ئەگونجێ بێتە هەوێنی گۆڕانکارییەکی هەستپێکراو لە رەوشتی خوێنەردا .**

هێنانەوەی ئەم نموونانە تەنیا لەبەر ئەوەبوو تەمی گومان لەدەوری مانگی رووی ئەو ڕاستییە دوور بخەمەوە کە هونەر بەگشتی ـ دیارە ئەدەب بەشێکی پێك ئەهێنێ ـ شێوەیەکە لە شێوەکانی ووشیاری کۆمەڵایەتی بۆیە پەیامی تایبەتی خۆی هەیەو کۆمەڵێ ئەرکی مەعریفیو ئایدۆلۆژیو پەروەردەیی ڕووبەڕوو ئەبێتەوە کە ناچارە جێبەجێیان بکات ، ئەم

بۆچوونەش وەنەبێ تازە سەری هەڵدابێ بەڵکو بناغەکەی ئەگەڕێتەوە بۆ ئەرەستۆ کە پێی وابوو : ئەوی تراژیدیا ئەنووسێ ئەیەوێ لەڕێی وروژاندنی بەزەیی‌و ترسەوە هەوڵی خاوێن کردنەوەی مرۆڤ بدات . کەواتە هەموو نووسەرێك پێویستە لە هەموو بەرهەمێکیدا ئەرکی ئەدەب فەرامۆش نەکات‌و ئەوەی لەیادبێت کە لێپرسراوە بەرامبەر بەو قۆناغە مێژووییەی کۆمەڵەکەی پێدا تێپەڕ ئەبێ.لەسەروو ئەمانەشەوە ناچارە لە هەموو بەرهەمێکیدا شتێکی وەها بڵێت کە گۆڕێ بدات بەرەوتی پێشکەوتنی کۆمەڵ .

ئەمادۆ لە ڕێگاکانی برسێتیدا ئەڵێ : ئەگەر موڵکی خۆ نەمێنێ . ئافرەت ناچار ئەبێت لەشی بفرۆشێ.ئافرەت خاوێنە. ئەگەر پەیوەندیەکانی بەرهەم هێنان لەسەر بناغەی چەوساندنەوەی مرۆڤ دانەمەزرێ . ئافرەت بەردەو داوێن پیسی ناڕوات ئەگەر چەوساندنەوەی چینایەتی لەناو بچێت .

شتاینباك لە هێشووەکانی تووڕەییدا ئەڵێ :

■ کاتێ سەرمایە لەچەند دەستێکی کەمدا کۆ ئەبێتەوە لەناو چوونی شتێکی حەتمییە .

■ کاتێ زۆربەی خەڵکی برسێتی زۆریان بۆ ئەهێنێ . ئەوی پێویستیانە بەهێز دابینی ئەکەن .

■ چەوساندنەوە هەوێنی بەهێز بوون‌و یەکگرتنی چەوساوەکانە .

مارکیز لە چیرۆکی دەریاوانە نوقم بووەکەدا ئەڵێ : مرۆڤ کە هەستی کرد لە مردن نزیك ئەبێتەوە . پشکۆی ئارەزووی ژیان زیاتر لەدڵیا ئەگەشێتەوە . حەننا مینە لە پاشماوەی وێنەکاندا ئەڵێ : ئەوانەی لە برسا ئەمرن . لەوە ناترسن گوللە سنگیان بکاتە بێژنگ .

دەبا بزانین چیرۆکنووسانی کورد چی ئەڵێن ؟ پێش ئەوەی وەڵامی ئەم پرسیارە بدەمەوە . ئەم سێ سەرنجە ئەخەمە روو:

**١ – بۆ زانینی ئەو بیرەی هەر چیرۆکێك ئەیەوێ بیدا بەدەستەوە ، نابێ نە بەو سەرنج‌و بیروڕا راستەو خۆیانە قایل بین کە نووسەر بە ئاشکرا دەستی خستۆتە ناو دەقەکەوە ، نە بەقسەو بۆچوونی کەسانی ناو چیرۆکەکە ، بەڵکو ڕووداوەکانی ناو چیرۆکەکەو چۆنێتی گەشەسەندن‌و کۆتایی هاتنیان‌و ڕەوشت‌و خووی پاڵەوانەکان‌و هەڵس‌و کەوتیان لەگەڵ واقیعدا ئەمانە هەموویان ئینتیمای فیکریی کارە ئەدەبییەکە دەرئەخەن(٢) ئەمەش ئەوە ناگەیێنێ کە نووسەر بۆی نەبێت بیروڕای خۆی لەسەر ڕەوتی چیرۆکەکە دەربڕێت یان نەتوانێ تێڕوانینی خۆی لەڕێی یەکێ لە پاڵەوانەکانەوە–جا پاڵەوانێکی سەرەکی بێت یان نە– بخاتە روو بەمەرجێ ئەو پاڵەوانە لەبار بێت بۆ گەیاندنی بیروڕای نووسەر .**

**٢ – پەیوەندی بە هۆیەکانی بەرهەم هێنانەوە جێ پێی چینایەتی‌و ئایدۆلۆژیای هەر چینێك دیاری ئەکات‌و لە کۆمەڵگای فرەچینیدا بەپێی یاسای دابەشبوونی کار هەر کەسێ کارێکی بۆ دیاری ئەکرێت ، بۆیە هەموو کەسێ بێ ئەوەی هیچ دەسەڵاتێکی هەبێ سەر بەچینێکەو پەیوەندی ئەو کەسە بەهۆیەکانی بەرهەم هێنانەوە ئەو چینەی بۆ دیاری کردووە ، کەواتە چیرۆکنووس کاتێ پاڵەوانەکانی هەڵئەبژێرێ ، ئەبێ ئەو ڕاستییەی لەبەرچاوبێت کە هەریەکێ لەو پاڵەوانانە وەك بیرو بۆچوون وەك ڕەوشت‌و خوو ، وەك هەڵس‌و کەوت ، وەك باری دەروونی‌و هەموو ڕووکارەکانی‌تر نوێنەری چینێکە .**

**٣ – هونەر بەگشتی تیغێکی دوو دەمەو بەهەردوو لادا ئەبڕێ ، یان بەشداری ئەکا لەڕەوتی گەشەسەندنی کۆمەڵدا یان ئەبێتە کۆسپ لەبەردەم ئەو ڕەوتەدا ، یان تۆوی بڕوا لەدڵا ئەچێنێ یان وورە بەمرۆڤ بەر ئەدا ، گوللە توێێکە لەقەڵای چەوسێنەراندا یان لەسەنگەری چەوساوەکاندا ئەتەقێتەوە ، شۆلۆخۆف‌و هەمەنگوای چەند ڕۆڵیان هەبووەو هەیە لەبەرزکردنەوەی دیواری وورەی مرۆڤدا، جۆیس‌و پرۆستیش ئەوەندە ڕۆڵیان هەبووەو هەیە لە ڕووخاندنی ئەو دیوارەدا .**

چیرۆکنووسانی کورد چی ئەڵێن ؟ بۆ وەڵام دانەوەی ئەم پرسیارە روو بەرووی پاڵەوانانی ئەو کورتە چیرۆکانە ئەبمەوە کە بەنموونە ئەیان هێنمەوە ڕووناکیش ئەخەمە سەر پەیوەندی نێوان پاڵەوانەکان‌و ڕووداوەکان .

پاڵەوانی چیرۆکی توانەوەی ڕەئووف بێگەرد(٤) ئافرەتێکی ماڵمۆستایە بۆ شووکردن سوێی بۆتەوە . لەبەر ئەوەی لاوازو کورتە بنەیەو ڕووخساریشی پڕ چرچ‌و لۆچە واهەست ئەکا شایانی بەزەیی پێدا هاتنەوەیە . ئەمانەش ئەوە لەگوماندا ناهێڵنەوە کە گرێی کەموکوڕی هەیە . ئەم ئافرەتە شەیدای کوڕێکی قۆز بووە . کوڕەش مێشێ میوانی نیە . ئەم ئافرەتە حەز ئەکا ڕەوڕەوەی مێژوو بەرەو دواوە بگەڕێتەوە تەنیا لەبەر ئەوەی شووبکات . ( زۆر جار دایکم بۆی گێڕاومەتەوە نە باوکم ئەمی دیبوو . نە ئەمیش ئەو . ئەوسا چ دنیایەکی خۆش بوو.. بۆ لەباتی دایکم من نەبووم ) . ئەمە بیرکردنەوەی پاڵەوانەکەیە . ڕووداوەکەش ئەوەیە ئەم کچە کاتێ بەرەو قوتابخانە ئەچێ لەڕێ کوڕە قۆزەکە ئەبینێ‌و چەند جارێ بەم‌لاو بەولایدا تێئەپەڕێ دواجار کوڕەکە ئەبینێ شان بەشانی کچێکی شۆخ ئەڕوات‌و خەرێکی ڕازو نیازە لەگەڵیدا ئیتر ئەمیش پەستی دای ئەگرێ‌و قوتابخانە پشتگوێ ئەخاو بەرەو ماڵ ئەبێتەوە .. چیرۆکنووس ئەیەوێ بڵێ چی ؟ ئەیەوێ بڵێ : کچینە ئەگەر کوڕێکی قۆز حەزی لێ‌نەکردن لەماڵەوە دابنیشن‌و کارکردن پشتگوێ بخەن!

یان ئەیەوێ بلێ ژیان تەنیا گەڕانە بەدوای شـــــووکردندا .
چیرۆکنووسی ووریا ئەزانێ حالەتێکی وەها ناکرێ بەدیاردەیەکی
گشتیو بەسەر خوێنەردا ساغ ناکرێتەوە ، چونکە ئەم ئافرەتە
مامۆستایە نوێنەری راستەقینەی مامۆستایانی ئافرەت نیە ،
لێرەدا ئەپرسم بۆ نموونەی مامۆستای ئافرەت وەك پالەوانی
چیرۆکی قوتابخانەی لادێی چیرۆکنووسی ڤێتنامی کــــزوان
ساش(٥) نەبێت ! کە ئەمیش هەر کچێکی مامۆستایە لەدێیەکداو
لەسەر دوو دار شەق خۆی ئەکا بەپۆلداو قاچێکی لەسەروو
ئەژنۆیەوە نەماوە کەچی بەوپەڕی لەخۆ بوردنەوە دوا توانای
خۆی خستۆتەکار بۆ فێرکردنی منداڵانی دێیەکە ، قاچەکەشی
لەئەنجامی رزگار کردنی قوتابییەکی خۆیدا لەدەست بۆمبای
فرۆکەکانی دوژمن نەماوە . چیرۆکنووسە ڤێتنامییەکە پێمان
ئەڵێ : مامۆستاش تێکۆشەرێکە لەسەنگەری یەکەمی بەرامبەر
دوژمن دایەو خەمی میللەتەکەی بـــەکۆڵەوەیە . رەئووفیش
ئەڵێت : ئافرەتی مامۆستا پەروانەی باڵ ســـــووتاوی دەوری
مۆمی سێکسە . جێی سەرنجە هەر لەو ژمارەیەی بەیاندا کە
چیرۆکی توانەوەی تێدا بڵاو کراوەتەوە رەئووف بێگەرد لەیادی
یانزە ساڵەی گۆڤارەکەدا ئەڵێ : ( لای من تاقە پێوانەیەك بۆهەر
چاپەمەنییەك ئەندازەی جێگیر بوونێتی لە ناخی جـــەماوەردا
ئەمەیش بەوە دەکرێت کە تاچەند ئەو چاپەمەنییە پـــەیوەندی
بەو ئەدەبە رەسەنەوەیە کە تەواو تەعبیر لەخولیاو ئــــاواتی
جەماوەر دەکەن . ) دەربارەی ئەم سەرنجەی چـــیرۆك نووس
تەنیا ئەوەندە ئەڵێم کە چیرۆکی توانەوە نەك تەواو بەڵکو بەهیچ
جۆرێ تەعبیر لەخولیاو ئاواتی جەماوەر ناکا چونکە خولیـــــاو
ئاواتی جەماوەر لەشووکردن گەورەترە .

پالەوانی چیرۆکی ــ پەتا ــ یشی(٦) لەترسا گاڵی هێناوەو
واهەست ئەکا هەوێنی پێکەنینی خەڵکی شارەو خۆشی بەنامۆ
ئەزانێ . جێی سەرسوڕمانە ئەوانەی پێی پێ ئەکەنن لەهەموو
روویەکەوە زیاتر ئەوەیان لەباردایە کە بەر لەم گاڵیان هێنابێ.
خاوەن کۆگایەکو دوکتۆرێکو خاوەنی ئوتومبیلێك بۆ پاراستنی
بەرژەوەندی خۆیان رێی تێئەچێ زووتر تووشی پەتا کە ببن
وەك لەم پالەوانە کەهیچی نیە تا لەدەستی بچێ . لەمانـــــەش
نەگونجاو تر ئەوەیە فەڕاشی دوکتۆرەکەش هەمان پەتای تووش
بووە . لێرەدا دوو بۆچوون هەیە یان ئــــەمە هــــەڵەیەو
چیرۆکنووسی تێکەوتووە ، یان بەو پەڕی ووشیارییەوە جامی
غەزەبی بەسەر هەژاراندا قلپ کردۆتەوە ، بەڵام لەهــــەر دوو
حاڵەتەکەدا چیرۆکنووس هەر بەرپرسیارە ئەگەر لەحــــاڵەتی
یەکەمدا حسابی غەفلەتی بۆبکرێ ئەوا لەحاڵەتی دووەمــــــدا
دەکەوێتە بەر لێپرسینەوە بەوەی پێمان ئەڵێ : ئــــەوانەی
بەخەڵکو خەڵك نامۆ ئەبنو گاڵ ئەهێنن تەنیـــــــا هــــەژارو
زەحمەتکێشەکانن . بەڵام پیاوانی خانەدانو خاوەن کۆگاو پایەی
بەرز هەمیشە پەیوەندییەکی پتەویان بەخاڵکو خەڵکەوە هەیەو
هەر پەموو ئەهێنن ، کە ئەمە پێچەوانەی حەقیقەتی مێژووی
هەموو نەتەوەیەکە لەسەر رووی زەمینداو نەتەوەی ئێمــــەش
لەسەر زەوی ئەژی ، ئەوەش لەگوماندا نەماوەتەوە کە ئاغاو
بەگو بۆرژوا لەهەموو جێیەکی ئەم زەمینەدا لەپێناوی پاراستنی
بەرژەوەندی چینایەتی خۆیاندا هەموو دەمێ ئامادە شــــەقێ
لەخاڵکو نەتەوە هەڵ بدەن ، بەپێچەوانەوەی رەئووف بێگەردەوە
چیرۆکنووسی ئەڵەمانیایی ریمارك ئەڵێ : ( مادام خاوەنی هیچ
نیت ئەتوانی هەڵوێستی ئازایانە بنوێنی بەڵام کە بوویتە خاوەنی
موڵك نواندنی هەڵوێستێکی ئازایانە ، شتێکی گەلێ گرانە)(٧).

پالەوانی چیرۆکی ــ بەردو خوێن ــی ئەمینی مـــــیرزا
کەریم(٨) ئافرەتێکی بە ئالۆشەو خۆی هـــاوار ئەکاو ئەڵێ :
( فەرموو ئەوەتا حەزی لێئەکەم ، رێبوارێکیش بـــە رووتی بم
بینێ هەر خۆشە ، خۆزگەم بەو سەگانە لەهەرکوێ ویستیان
بەیەکەوە دەلکێن . ) ئەم ئافرەتە تەنیا لەبەر ئەوەی مێردەکەی
لەماڵ نیە ئامادەیە لەسەر گازەرای پشت بۆ دراوسێکەیان پاڵ
بکەوێو دواجار مۆمێك بکاتە چلوورەیەکو ئالۆشـــەکەی پێ
دابمرکێنێتەوە، ئەمە هەڵــو کەوتو بیرکردنەوەی پالەوانەکەیە.
لەولاشەوە دراوسێکەیان لەبەر ئەوەی ژنەکەی بێنوێژە پەنا
ئەباتە بەر دەستی . کەواتە لای چیرۆکنووس ژیان ســــەراپا
بریتییە لە دامرکاندنەوەی ئالۆش بۆیە لەرێی چیرۆکەکەیەوە
ئەیەوێ رێگەی دامرکاندنەوەی ئالۆش نیشانی خوێنەران بدا
کەلای چیرۆکنووس وەك دەرئەکەوێ باشترین رێگەکانی نەهاتی
بۆ ئافرەت مۆمو بۆ پیاو دەستە . چیرۆکنووس نەك هەر هیچ
سنوورێکی لەنێوان مرۆڤو ئاژەڵدا نەهێشتۆتەوە بەڵکو مرۆڤی
ئەوەندە هێناوەتە خوارێ وای لێکردووە ئاوات بەژیانی سەگ
بخوازێ . جێی گومان نیە هەموو بەرهـــەمێکی ئـــەدەبی
رەنگدانەوەی ئایدۆلۆژیای نووسەرەکەیەتی . ئەگـــەر ئەمینی
میرزا کەریم ئەم بیرو رایانەی خۆی لــــە چیرۆکەکانیـــــدا
بەشێوەیەکی ناڕاستەخۆ دەربڕی بێت ئــــەوا لەووتارێکیدا
تەواوی تێڕوانینی خۆی لەم بوارەدا بەئاشکرا دەربڕیوە کـــە
ئەمە پوختەکەیەتی : سەماکردن . ماچو مووچ . دەســـــت
گوشین ، هــەر یەکێ لەمانــە نارێکی ئاسایەو بۆ خزمەتی
کێشەی نەتەوەکەم بەکاریان دەهێنم . (٩) بە پێی ئاگاداری
من لەباری کۆمەڵایەتی کوردەواری ئەشێ بەهەڵەدا نەچم ئەگەر
بڵێم لای ئێمە تا ئێستا خۆشویستنی پاکیش نارادەیەکی باش
قەدەغەیە ، کەچی ئەمین وەك کوردێك سەما کردنو مـــاچو
مووچ بەئاسایی ئەزانێ . لێرەدا نازانم کە کار گەیشتە سەماو
ماچ مووچ دوای ئەوانە چی ئەمێنێ . جگە لەمانە نووســــەری
رەسەن پەنا نابانە بەر رێی چەوتو چەوێڵ بۆ گەیشتن بـــە
مەبەست بامەبەستیشی خاوێن بێت. ئەگەر نووسەر لەخزمەت

کردنی کێشەی نەتەوەکەی بێت ، ڕێی میکافیلی‌یانە ناگرێتە بەرو ڕێی خاوێن‌و مەقوول هەڵ ئەبژێرێ‌و ( جەوهەری مەسەلەکە ) دەست نیشان ئەکا کە بەندە بەگۆڕکردنی جیاوازی چینایەتییەوە چونکە لەهەر کۆمەڵگایەکدا کە مولکی خۆ نەما، ئەو کاتە ئافرەت سەربەست ئەبێ لە هەڵبژاردنی هاوسەرداو لەسەر بناغەی خۆشەویستی‌و لەیەکتر گەیشتن شوو ئەکا بۆیە ناچار نابێ وەك ئۆژەل بڕوانێتە جنس،خۆ ئەگەر پەیوەندی‌یەکانی بەرهەم هێنانیش لەسەر بناغەی چەوساندنەوە دامەزرا بوو ئەو کاتە ئافرەت نەك هەر سەربەست نابێ لەهەڵبژاردنی هاوسەردا بەڵکو وەك هەر کەرەسەیەکی تری ناو ماڵ سەیری ئەکرێ کە ئەمە هۆی سەرەکی‌یە بۆسەر هەڵدانی داوێن پیسی وەك جەلیل قەیسی لەبەیانێکی پرشنگدارا دەرکی پێ کردووەو ڕووناکی خستۆتە سەر ئەو پەیوەندییە دایلێکتیکییەی نێوان داوێن پیسی و لەش فرۆشتن‌و باری کۆمەڵایەتی‌و ئابووری . سەرەڕای ئەمانەش ئەو ئافرەتەی ئەمینی میرزا کەریم نیشانی داوەو ئەو واقیعەی ئەو وێنەی کێشاوە نەك هەر لە ئافرەت‌و واقیعی کوردەواری‌یەوە دوورن بەڵکو واقیعو ئافرەتی بەو جۆرە مەگەر هەر لەخەیاڵی خۆیدا هەبێ .

ئەحمەد سەید عەلی بەرزنجی لە کۆمەڵە چیرۆکی دەستەو یەخەدا ئەڵێ چی ؟ بە ئاوڕدانەوەیەکی خێرا لەکەسان‌و ڕووداوەکانی چیرۆکەکانی وەڵامی ئەم پرسیارەمان دەستگیر ئەبێ . لە چیرۆکی ( گەوجێ لەشارەوە )دا ژنی کوێخا ئەنێرێ بەشوێن شاربیەکەداو داوای لێ ئەکا شەو سەری لێ بداتەوە . لەچیرۆکی ( کە ناپلیون ئەبێ بەپەند )دا مامۆستایەك هەرچەند لەسەر بناغەی خۆشەویستی ژنی هێناوە کەچی لەگەڵ کچێکی دراوسێ‌یا خەریکەو نیازی هەیە ژنەکەی بە کۆشێ منداڵەوە تەڵاق بدات . لە چیرۆکی ( تەڵاقی سێ بەسێ )دا ژنێکی خاوەن مێردو منداڵ لەناکاو ڕەدووی هەتیوێ ئەکەوێ . لە چیرۆکی ( دووان ، ئەم‌و ئەو )دا ژنێك دۆستی هەیەو لەقاچاخە ڕێوە خەریکە . لە چیرۆکی قۆرت ) دا ژنێك بەتەلەفون بەمێردەکەی ئەڵێ : ( ئەگەر تانیو سەعاتی تر نەیەیتەوە ئەچمە بەر دەرگاو هەر کەسێکم دی ئەی هێنمە ژووری ) . ژنەکە پەیمانەکەی بەجێ دێنێ‌و کچەکەشی هەڵدێ لەولا ترەوە مەمکەکانی زەلالەتیانە بەدەست کوڕێکەوە . لە چیرۆکی ( نەرێتێکی کۆن ) دا . تۆ بووکێك‌و ئافرەتێکی تر بە دوو قۆڵی خۆیان ئەگەێنە ماڵێك‌و هەر یەکەیان خۆی ئەکا بە ژووری تایبەتی دۆستەکەیدا . لە چیرۆکی ( سێ شولکی تەڕ ) دا خێزانێك بە دایك‌و باوك‌و کوڕەوە خەریکی داوێن پیسین بەهەموو جۆرەکانییەوە . لە چیرۆکی ( دەستەو یەخە ) دا مامۆستایەك هەر چەند ژنی هەیە کەچی لەگەڵ . ژنی یەکەمی کوێخادا خەریکە . ژنی دووەمی کوێخاش لەگەڵ کابرایەکی تردا هەر هەمان بەزم . لە چیرۆکی ( ژنێکی نەناسیاو ) دا ئافرەتێکی شۆخ ئابڕووی ئەتکێ‌و تەپلی بۆ لێ ئەدرێ . لەبەر ڕۆشنایی هەڵس‌و کەوتی پاڵەوانەکانی ئەحمەد دا ئەم ڕاستییانە ئەدرەوشێتەوە :

**١ ـ لای چیرۆکنووس ژیان سەراپا بریتییە لە تێربوونی جنسی‌و دامرکاندنەوەی ئالۆش .**

**٢ ـ ئافرەت بەگشتی کەم‌فام‌و لاوازو بەد ڕەوشتە .**

**٣ ـ کپ کردنەوەی ئارەزووی سێکس هەوێنی هەموو کردەوەیەکی چاك‌و داهێنانێکی نوێیە لە هەموو بوارێکدا . (چیرۆکی لە ڕێگەی ئاواتا تەرخانە بۆ سەلماندنی ئەم بۆ چوونە).**

**بە وورد بوونەوە لەم سێ‌خاڵە ئەوە لەگومانا نامێنێتەوە کە ئەحمەد ئەگەر پێشی نەزانی بێت هەر شوێن پێی فرۆیدی هەڵگرتووەو کەسانی چیرۆکەکانی بەشێوەیەکی نزمترو کەمتر وەك لەوەی لەواقیعدا هەن وێنە ئەکێشێ .**

**جێی دەمەتەقێ نیە کەپێویستە نووسەر بەبەهرە پشت ئەستوور نەبێ بەڵکو پێویستە ڕۆشنبیرییەکی تەواوی هەبێ لەهەموو بوارەکاندا ، ئەگەر ئەم بۆچوونە بۆ هەموو ئەدیبێك جێی خۆی بێت ئەوا بۆ چیرۆکنووس زیاتر خۆی ئەسەپێنێ، ئەوی زەوی بەپێتی پیرل پاکی خوێندبێتەوە هەستی کردووە ئەو نووسەرە ئەوەندەی شارەزایەکی لێهاتووی کۆمەڵناس شارەزای باری کۆمەڵایەتی وولاتی چین بووە ، هەستی کردووە کەسێکی وەك ماویش هەر ئەوەندەی ئەمو لەچین‌و توێژەکانی کۆمەڵگای چین تێگەیشتووە ، هەستی کردووە ئەگەر مێژوو نووسێك مێژووی ئەو قۆناغەی چین بنووسێتەوە لەرۆمانەکەی پیرل پاك سوود وەرئەگرێ ، کەواتە چیرۆکنووس جگە لەوەی پێویستە لەبواری ئەدەبەکەدا ڕۆشنبیرییەکی ڕەخنەیی تەواوی هەبێ ، ئەبێ شارەزای فەلسەفەو ئابووری‌و مێژووش بێت ، من پێم وایە بەدەگمەن چیرۆکنووسی ئەوەندە ووشیارمان هەیە، یەکێ لەهۆ سەرەکی یەکانی کەمی ڕۆمانیش ئەگەڕێتەوە بۆ نەبوونی ئەو ووشیارییە .**

لەوەڵامی ئەو ڕەخنەیەدا کە لەسەر ووردوخاش بوون بوون بڵاوکراوەتەوە ئەحمەد ئەڵێ : ( پەردە هەڵماڵین لەسەر عەیبە گەورەکانی خۆمان ئازایەتی‌یە )(١٠) مەبەستی ئەوەیە باسکردنی چۆنێتی دامرکاندنەوەی ئالۆش لای بەد ڕەوشتەکان کارێکی شێرانەیە . بەپێی ئاگاداری من جاران ئازایەتی ئەوە بووە کرمانی‌ی شاعیر ڕووی کردۆتە تەیمووری لەنگ‌و پێی ووتووە : تۆ فلسێکی قەڵب ناهێنی ، ین نازم حیکمەت هەموو ژیانی لاوێتی خۆی کردۆتە خۆراکی زیندان‌و سەری نەوی نەکردووە ، یان فایەق بێکەس بەرووی ئەدمۆنزا تەقیوەتەوە.

ئەحمەد لەهەمان نووسیندا ئەڵێ : ( من کە ئەو کچەم

کردۆته پاڵەوانی چیرۆکەکەم مانای ئەوە نیە کە لەهەمان کاتدا وەك سیفەتێکی گشتی بیدەمە پاڵ هەموو ئافرەتێك ) . ئەی کەواتە مەبەستی چییە ؟ تۆ بڵێی بەتەنیا قینی لەو کچە بەستەزمانە بێت ! ئاری چیرۆك بنووسێ پێویستە ئەوە بزانێ کە نووسەر کاتێ تەکە کەسێ لەکۆمەڵێ هەڵ ئەبژێرێ مەبەستی ئەوەیە لەرێی ئەو تاکە کەسەوە رووناکی بخاتە سەر هەڵسوکەوتو بیرکردنەوەو سایکۆلۆژیای چینەکەی یان لەرێی چەند کەسێکەوە وێنەی کۆمەڵگایەك بکێشێ . جگە لەمە پاڵەوانە کانی ئەحمەد سەر بە هەر چینو توێژێکی کۆمەڵ بن هەر بەدرەوستنو لای ئەم پاڵەوانێکی نیجابی شتێکی هێجگار دەگمەنە. لێرەدا من داوای ئافرەتی وەك پاڵەوانی دایکەکەی گۆرگی یان پاڵەوانەکەی ماڵی بووکە شووشەی ئەپسن لە ئەحمەد ناکەم چونکە وێنە کێشانی ئەو جۆرە پاڵەوانانە لەتواناو جۆری بیرکردنەوەی ئەو بەدەرن . بەڵام داوای لێئەکەم باخۆی لەو راستییە گێل نەکا کە کۆمەڵگای کوردەواری لەسۆزانیو هەوەس باز پێك نەهاتووە . کەسێ رۆشنبیرییەکەی لەم ئاستەدا بێ . چاوەرێی چی لێئەکری جگە لە دووبارە کردنەوەی ئەوەی ئەمجەد تۆفیق ووتوویەتی . هەر دەربارەی چیرۆکەکانی ئەحمەد ئەڵێم : ئێستا ئەو هونەرەی لە وڵاتە سەرمایەدارییەکاندا لە ژێر رکێفی چینی خاوەن دەسەڵات دایە دوو رێبازی سەرەکی گرتۆتە بەر :

**١ ـ هونەری رابواردن ، کە سەرەکی ترین جۆری ئەم هونەرە ئەو رۆمانە نوێیانەیە کە تەرخانن بۆ باسکردنی جنسو بەمەبەستی خەساندنی جەماوەر ئەنووسرێن .**

**٢ ـ هونەری پوخت : ئەو جۆرە هونەرەیە کە تەرخانە بۆ تاقمە هەڵبژاردەکەی کۆمەڵو تەنیا گرنگی بەلایەنی هونەری ئەداتو ناوەرۆك پشتگوێ ئەخا(١١) ، چیرۆکەکانی ئەحمەد ئاو بەئاشی رێبازی یەکەمدا ئەکەن .**

سیماو مۆرکی هەموو پاڵەوانێکی وجودی لەوەدا رەنگ ئەداتەوە کە وەك تاکە کەس شەیدای سەربەستییە لە هەڵبژاردنی هەڵوێستا ئەمە وای لێ ئەکا تووشی دڵە راوکێ بێتو خۆی بەنامۆ بزانێو دووچاری بێئومێدیوورەش بینییەکی کوشندە بێت تا ئەگاتە ئەوەی وای بۆ ئەچێ ئەم جیهانەو ژیانی ئەمیش شتێکی بێ مانایە . بۆیە لەگەڵ کۆمەڵگاو سەردەمەکەیدا هیچ پەیوەندییەکی نامێنێو لە چاکترین ماڵەتدا خۆی لەبارو سەردابە تاریکەکاندا ئەبینێتەوە . وجودیەت وەك فەلسەفەش دیسان هەوڵی لەناو بردنی پەیوەندی نێوان مرۆڤو کۆمەڵ ئەداتو لەهەستکردن بە لێپرسینەوەی کۆمەڵایەتی دووری ئەخاتەوەو نوقمی گۆمی رێبازی تاك رەوی یە بۆیە ترسناك ترین جۆری فەلسەفەی بۆرژوایە(١٢) .

پاڵەوانی چیرۆکی ( مردووو خەون نابینێ )ی عبداللە سەراج(١٣) هەموو رووکارە کانی پاڵەوانێکی وجودی تێدایە . ئەم پاڵەوانە سەربەست نیە لە دەربڕینی هەستی خۆشەویستیدا بۆیە دووچاری دڵەڕاوکێیەکی وەها بووە . نازانی چی ئەکاو چی ئەڵێ . بەوپەڕی نائومێدیو بێ وورەییەوە ئەڵێ : (خۆزگە کوێر ئەبوومو ئەم رۆژەم نە ئەدی ) . هەست بەنامۆییو تەنیایی ئەکاو ئەڵێ : ( ئێستە هەموو مێژوو بۆتە باخچەی قەد قەڵا . منیش لەم باخچە فراوانەدا مایە پووچ بووم ) . ئەم پاڵەوانە بێ ئومێدە کە دوا پەناگای چارەکە عارەقەکەیەو تێنە قاقای نوقمە لەزەلکاوی خودی خۆیدا . دوا جار گۆرانێکی کتوپڕو چاوەڕوان نەکراو بەسەر بیریدا دێ کە لەسەراپای چیرۆکەکەدا تەنانەت بەهێمایەکیش رێگەی بۆ خۆش نەکراوە . ئەمەش بێدەسەڵاتی چیرۆکنووس لەچنینی رووداوەکەدا نیشان ئەداو دەست تێخستنێکی زەقو نەشارەزایانەیە ( مرۆڤ دەشکێ بەڵام نابەزێ ) . خوێنەر هەست ئەکا ئەم بۆچوونە رەنگدانەوەی بیرو هەڵسوکەوتی ئەو پاڵەوانە رەش بینە نیەو بەزۆر بەسەریا سەپێنراوە .

لە چیرۆکی ئۆقرە شدا(١٤) پاڵەوانەکە ـ گوایە ئازادی خۆی ئەپارێزێ ـ مرۆڤێکی تاكو تەنیایە . تەنانەت دۆستو هاورێیەکانی خۆیشی ناناسێتەوە ، وەك چۆن سارتەر لەمێشدا خێزانێك پشتاو پشت تاوانبار ئەکا ، عبداللە سەراجیش لەم چیرۆکەیدا ئەڵێ : جیهان جەنگەڵێکەو هەموو خەڵکەکەشی هەر یەکی جۆرە ئاژەڵێکن . پاڵەوانەکەشی رازییە بەهەر گیانلەبەرێ ناو ببرێ تەنیا گوێدرێژ نەبێت .

پاڵەوانی چیرۆکی مێژووی ژمارە سفریش(١٥) بێ پێچو پەنا وەك وجودیەك خۆیمان پێ ئەناسێنێو دەقاو دەق فەرمایشتەکانی سارتەر ئەڵێتەوە : ( ئایا مرۆڤ سەربەست نیە لەدەربڕینی هەستو بیرو بۆچوونی خۆی . سەری گرتەنە ئالێرەوە دەست پێ ئەکا ) . یان ئەڵێ : ( خۆم بەرپرسیارم مرۆڤیش سەربەستە لە هەڵبژاردن ) یان : ( گرنگ ئەوەیە برمان بەسەر خۆمانا دابڕین ) . ئەم سێ چیرۆکە بەڵگەیەکی رەت نەکراوەیە بۆ دڵنیا بوون لەوەی کە عبداللە سەراج وەك وجودیەك بیر ئەکاتەوەو ئەیەوێ لەرێی چیرۆکەکانییەوە بیروڕای وجودییانەی خۆیمان پێ بگەیێنێ . ئەگەر هەندێ نووسەری تر بێ ئەوەی پێبزانن ناو بەناو بیروڕای وجودیەکان لە بەرهەمە کانیاندا رەنگ بداتەوە . ئەوا عبداللە سەراج لەو نووسەرانە نیە بەڵکو ئەم بەتەواوی ووشیارییەوە وجودییەو بەرگری لە فەلسەفەی وجودیەت ئەکا ، ئەو فەلسەفەیەی کە لە ئەدەبی بۆرژوادا لە دوا قۆناغو لەسەردەمی هەرەس هێنانی سەرمایەداریدا رەنگی داوەتەوەو دوورو نزیك نابێتە ئاوێنەی

واقیعی ئەمە .

پاڵەوانی چیرۆکی تەنیایی شەوێکی بارانی شێرزاد حەسەن(١٦) تەمەنی چەندە. تەمەنی گرنگ نیە. لەکوێ فەرمانبەرە دیسانەوە گرنگ نیە. ژمارەی ئەندامەکانی خێزانەکەیان چەندە؟ ئەبێ بیر بکانەوەو بیان ژمێرێ . ئەم پاڵەوانە پەستو وەڕسو داهێزراوەو ئەترسێ وەك حوسەین مەردانی بەسەر بێت ، نەشەو ئەزانێ نەرۆژ . هەمیشە لەلای هەر قیامەتە . بێزارە لەم دنیایەی پڕێتی لەدزو لۆتیو جەردەو قۆلبڕو قومارچی ، شریتی تەمەنی سەراپا سەر گوزشتەی نائومێدیەتیو ژوورەکەی وەك سێ گۆشەی پەرمۆدا قووتی ئەداو هەموو خەڵکەکە بەگێلو گەلحۆو گەمژە دێنە بەرچاوی . رۆژەکانی ژیانی هەموویان لەیەك ئەچن . ئەم پاڵەوانە تەواو بێزارە بەڵام ناتوانێ هیچ بکا.

لەم چیرۆکەداو لە هەموو بەرهەمەکانی نووسەرانی ئەدەبی ناماقوولدا هەست بە رەشبینیو بێزاریو بێئومێدیو ونبوون ئەکرێو ئەو نووسەرانە پێمان ئەڵێن : تروسکەی هیوا بۆ دوا جار ماڵ ئاوایی لەژیان کردووە بۆیە ژیان چەوروانی کردنێکی بێ هوودەیەو مرۆڤ هیچ تواناو دەسەڵاتێکی بەسەریدا نیەو گۆڕینی ژیان لەلایەن مرۆڤەوە شتێکی مەحاڵە . ئەم نووسەرانە ئەوەندەی بتوانن تۆوی نائومێدی لەدڵی خەڵکیدا ئەچێنن و لەبری ئەوەی ڕێگەی دەرباز بوون لەبەر دەمیا تەخت بکەن ئەوەندەی تر قوڕەکە خەست ئەکەنەوە . هەندێ لەم نووسەرانە ئەوەندە بەستە زمانن وا هەست ئەکەن بە دەربڕینی ئەم بێزاریە بەم شێوە سلبیە دژی رژێمی سەرمایەداری رائەوەستن . بەڵام سەرمایەدارەکان وورین و ئەزانن ئەم ئەدەبە زیانی بۆ پەزەکانیان نیە چونکە وەك حەبی خەو وایە بۆ چەوساوەکان هەر بۆیەشە لە برەو پێدانی درێغی ناکەن .

گریمان ژیان سەراپا شەوەزەنگە وەك شێرزاد بۆی ئەچێ ، بەڵام نەی وەك نووسەرێك ئەڵێ چی ؟ خەڵکەکە چی بکات ؟ بەدیلی چییە ؟ شێرزاد وەڵامی ئەم پرسیارانە ناداتەوە چونکە واقیع لەبارو دۆخێکی نەگۆڕدا ئەبینێ بۆیە بەشێوەیەکی نەگۆڕیش وێنەی ئەکێشێ . جگە لەمە چیرۆکنووس تەنیا خەمی خۆی بەکۆلەوەیەو گۆڕینی واقیعی مەبەست نیە ، مەینەتییەکە لەوەدایە چیرۆکنووس بۆ سەربەستی خۆی ئەگرێو دەرکی بەوە نەکردووە کە مرۆڤ وەك تاکە کەس هەرگیز سەربەست نابێو سەربەستی تاکەکەسی بەندە بە سەربەستی کۆمەڵەوە .

خاتوون پاڵەوانی یەکەم چیرۆکی پەرستگای عبدالله عزیز خالد ئافرەتێکی بێ قۆلە ، پاڵەوانی دووەم چیرۆکیشی چایچییەکی کۆلە ، پاڵەوانی پێنجەم چیرۆکی لاوێکە بەدیار وێنەی هاوڕێ کوژراوەکەیەوە ئەکڕووزێتەوە . پاڵەوانی شەشەم چیرۆکی کچێکە نوقمی دەریای خەمو پەژارەیە . پاڵەوانی یەکەم چیرۆکی بابە نۆئێل تۆراوە ؟ لەسەرەتای شێت بووندایە ، پاڵەوانی دووەم چیرۆکی شێتێکی تەواوە . پاڵەوانی سێیەم چیرۆکی بەزۆر کراوە بەشێت . پاڵەوانی چوارەم چیرۆکی خۆی ئەخنکێنێ . نووسەر کە وێنەی ئەم پاڵەوانانەی کێشاوە نەك هەر نەیتوانیوە بەناخیاندا شۆڕبێتەوە بەڵکو هەر چەندە لەدیوی دەرەوە باسی کردوون کەچی هەر کەوتۆتە هەندێ هەڵەی کوشندەوە . لە خاتوون دا پاڵەوانەکە بەیەك دەستەوە بەنان پێوەدەری خۆی بەخێو ئەکات . لە بابە نۆئێل تۆراوەدا کوڕێکی چوار ساڵان بۆ بووکە شووشە ئەگری .. تائێرە وەك پاڵەوان ، وەك رووداویش . لەچیرۆکی هەمە کۆڵدا رووداو نیە ، لە چیرۆکی تابلۆی دیمەنی خەمبارێکی ئازار دراو دا رووداو لێدانی جرتێکە ، لە خاتوونو زۆربەی چیرۆکەکانی تریدا رووداوەکان ئەگەڕێنەوە بۆ رابوردوویەکی دوورو بەهیچ جۆرێ پەیوەندیان بە ئێستاوە نیە .

عبدالله لەڕێی ئەم پاڵەوانە سەقەتو شێتو خەمبارانەوە چی ئەڵێ ؟ لە چیرۆکی ( کاتی تاوانبار خۆی لە وەفادارێتیدا ئەدۆزێتەوە ) دا ئەڵێ : بێ ئیجازەی لێ خوڕین . ئوتومبیل لێ مەخوڕن . لە ( تابلۆی دیمەنی خەمبارێکی ئازار دراو دا ئەڵێ: جرت لێدان کارێکی ناشیرینە لە ( دەریای ئازار ) دا ئەڵێ : بە نیازی ئاو خواردنەوە روومەکەنە مزگەوتی گەورە چونکە مەرکانەکەی ووشكو برنگە لەچیرۆکی ( تاوان لەژێر داری زرڕدا ) پێی وایە کۆمەڵگا لەڕێی ئامۆژگاری یەوە لەبەد رەوشتی خاوێن ئەکرێتەوە . لەبەر رۆشنایی ئەم کۆمەڵە سەرنجە بروسکەیەدا ئەگەینە ئەو سەرەنجامەی کە عبدالله :

**١ ـ لەگۆشەیەکی تەسکەوە ئەڕوانێتە جیهانو تەنیا کاری خراپو مرۆڤ پەستو نەخۆشو ناتەواو ئەبینێ .**

**٢ ـ دەرکی بەوە نەکردووە کە چیرۆك بێ رووداو دروست نابێ .**

سەرەڕای ئەم سەرنجە بێدەسەڵاتی نووسەر لەبواری زمانەکەشدا دەلاقە یەکی گەورەتری کردۆتە چیرۆکەکانییەوە . لێرەدا ناچارم بڵێم ئەوی نیازی نووسینی هەبێ پێویستە پێشەکی زمان بزانێ چونکە کەرەسەی سەرەکی دەربڕین لای نووسەر زمانە ، ئەگەر نووسەر نەیزانی چۆن مامەڵە لەگەڵ ووشەدا ئەکرێ ئەوا وەك ئەرەستۆ ئەڵێ : ( ئەوی خوازە لەجێی خۆیدا بەکار نەهێنێ لە کاتێکدا واهەست ئەکا وێنەیەکی باڵای کێشاوە ، وێنە کەی ئەبێتە مایەی پێکەنین )(١٧) . ئەم وێنە کاریکاتێریانە نەخۆشییەکە هەموو چیرۆکەکانی عبدالله تووشی هاتوونو بەشێوەیەکی سلبی کاری کردۆتە سەر رووداوی

چیرۆکەکان ، بۆ نموونە لە چیرۆکی ( ناپاك ) دا کاتێ نووسەر ڕووداوێکی دڵتەزێن ئەگێڕێتەوە بۆ دەسەڵاتییەکەی لە بواری مامەڵەکردن لەگەڵ ووشەدا کە ئەڵێ : (لەم ساتەدا هانینی ڕیزێ پەرداخ ئاو کلکی باسەکەی قرتاند . ) کارێکی وای کردووە خوێنەر نەك هەر خەم دای ناگرێ بەڵکو ئەداتە قاقای پێکەنین . پێویستە ئەوەش بڵێم کە چیرۆکی تاوان لەژێر داری زڕدا(۱۸) وەك پاڵەوانو ڕووداو لە سێبەری خلزێ دا نووسراوەتەوەو(۱۹) چیرۆکی کوچ‌یش(۲۰) جێ پەنجەی خاکە وونبووەکەی جۆرج فریتاکی پێوە دیارە(۲۱) .

پاڵەوانی چیرۆکی ( هونەرمەند ) ی دوکتۆر کاوس قەفتان(۲۲) هەنەرمەندێکی گەمژەیەو دوا کەسە هەست بە گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتییەکان ئەکات . ئەم هونەرمەندە کە ئوتومبیلەکەی یەکی ئەکەوێ تاماوەیەکی زۆر کەسێ ئاوڕی لێ ناداتەوە ، دوا جار ئەو کەسەی بەهانایەوە دێت ، قۆڵی لە بنا ئەبڕێت . دوکتۆر کاوس لەم چیرۆکەی‌دا ئەڵێ : ئەگەر لە ڕێگاو بان لێتان قەوما داوای یارمەتی لەکەس مەکەن .

بابەتی ئەم چیرۆکە بابەتێکی بەپێزەو هەوێنی دەیان کورتە چیرۆكو ڕۆمانە ئەگەر نووسەری بەتوانا مامەڵەی لەگەڵدا بکات ، لەناو چوونی پەیوەندییەکۆمەڵایەتییەکانی قۆناغی دەرەبەگایەتی و سەر هەڵدانو جێگیر بوونی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی قۆناغی سەرمایەداری بابەتی چیرۆکەکەیە ، جێی گومانیش نیە هەر قۆناغە ڕەوشتو خووی تایبەتی خۆی هەیە ، وەك چۆن لەقۆناغی دەرەبەگایەتیدا ڕەوشتو خووی دەرەبەگەکان زاڵە ، هەرواش لە قۆناغی سەرمایەداریدا ڕەوشتو خووی بۆرژوواکان سەروەرە . کەواتە ئەم کێشەیە کێشەکی گەلێ گرنگەو بەو شێوە ساکارەی دوکتۆر کاوس بۆی چووە چارەسەر ناکرێو هەوێنی زۆر ڕۆمانی وەك ڕێگاکانی برسێتی‌ی جۆرج ئەمادۆیە ، بۆیە لاوازی چیرۆکەکە ناگەڕێتەوە بۆ بێ‌بێ‌پێزی بابەتەکە بەڵکو بۆ جۆری مامەڵەکردنەکە لەگەڵ بابەتەکەدا، ئەگونجێ بەسەرهاتی پاڵەوانی ئەم چیرۆکە لە واقیعدا رووی دابێت ،بەڵام چیرۆکنووس ئەبێ ئاگاداری ئەوە بێت کە ئەو ڕۆژنامەنووس نیە تا هەواڵ بگەیێنێ بەڵکو نووسەر نەخشەی جیهانێك ئەکێشێ باڵاترە لەجیهانی واقیع ، جیهانێکە نە پاشکۆی واقیعەو نەراستکۆیی هونەریشی تێدا فەرامۆش کراوە ، خۆ ئەگەر نووسەر دەقاو دەق ڕووداوێکی گێڕایەوە یان بەو پەڕی دەست پاکییەوە بەسەرهاتی کەسێکی نووسییەوە ئەوا ئەو نووسەرە مێژوو نووسە نەك چیرۆکنووس .

نووسەری وریا هیچ بەرهەمێکی نوێ بڵاو ناکاتەوە تا دڵنیا نەبێت لەوەی لەبەرهەمەکانی پێشووی بەپێز ترە یان لە ئاستی ئەوانی پێشووی دایە ، ئەگەر دوکتۆر کاوس‌یش وەهای بکردایە چیرۆکی هونەرمەند ڕووناکی نەئەبینی .

کاکە مەمی بۆتانی وەك هەموو نووسەرێکی بەتوانا لەڕێی چیرۆکەکانییەوە نەك هەر ئاوڕ لەکێشە گرنگەکانی سەردەمەکەی ئەداتەوە بەڵکو بیروڕاو بۆچوونی خۆیشی دەرئەبڕێو نەخشەی جیهانێکی نوێ ئەکێشێ ، لەچیرۆکی بازنەدا(۲۳) لە ڕێی دوو هاوڕێوە ڕووناکی ئەخاتە سەر کێشەیەکی سەرەکی ئەم سەردەمە ، ئەو دوو کەسە کە هەردوو پاڵەوانە سەرەکی‌یەکەی چیرۆکەکەن ، ئەوەندە شارەزایانە مامەڵەیان لەگەڵ ئەکرێو هەڵسوکەوتو چۆنێتی بیر کردنەوەیان نیشان ئەدرێ ، خوێنەر هەردووکیان ئەناسێتو ئەزانێ سەر بەکام فیکرو ڕێبازن . ڕێبازی یەکەم هەنگاو نانەو ئەوی تریان گیرخواردنە لەبازنەیەکی دیاری کراودا ، چونێتی کۆتایی پێ هێنانی ڕووداوەکەش تەواو لەڕاژەی فیکری نووسەر دایە کە ئەیەوێ بڵێ : ئەوی بڕوای بەخەباتی چینایەتی هەبێت ناچارە بڕوا بەشەڕی براکوژیش بهێنێ . نووسەر ئەوەش لەگوماندا ناهێڵێتەوە کە چەوسێنەران هەموو ڕێیەکی دڕندانە لەپێناوی سەرکوت کردنی چەوساوەکاندا ئەگرنە بەر ، بۆیە چەوساوەکان بەوروژاندنی سۆزو بەزەیی ڕزگاریان نابێت ، ڕووداوەکانی سەرەتای حەفتاکانی چیلی ڕاستی ئەم بۆچوونەی چیرۆکنووس ئەسەلمێنن . ئەلێندی چەند سوور بوو لەسەر ئەوەی ڕێگەیەکی هێمن بگرێتە بەرو خۆی لە شەڕی براکوژی لابدات بەڵام ئەنجام بەدژوارترین شێوە تووشی هات .

کاکە مەم دەرکی بەو ڕاستییەش کردووە کە چەوسێنەران بە پێ‌داگرتن لەسەر چەوساندنەوە ، چەوساوەکان بەرەو وەرگرتنی هەڵوێستو تەقینەوە هان ئەدەن ، بەڵام ئەو ڕێبازەی کە لە بازنەکەدا گیری خواردووە ئەیەوێ چوار پەلی ئەسپی چەوساوەکان ببەستێتەوە ، ئەو ڕێبازە ئاگادار بێت یان نەء لە ڕاژەی چەوسێنەران دایەو کۆسپە لەبەر دەم ڕەوتی مێژوودا ، بۆیە نووسەریش مۆری تاوانباری ئەنێت بە تەختی تەوێڵی ئەو ڕێبازەوە .

بەسەرهاتی نیشتمان پاڵەوانی چیرۆکی بەردیش بەرگەی ئەم ئازارە ناگرێ(۲٤) تەرخانە بۆ پەردە لادان لەسەر ڕووخساری ئەو ڕاستییەی کە ڕێی زەنوێر بەچەپا ئەڕوا . لەم چیرۆکەشدا کاکە مەم ووشیارانە ڕووناکی خستۆتە سەر پەیوەندییە جەدەلییەکەی نێوان خەباتی چینایەتی‌و خەباتی نەتەوایەتی . کاتێ نیشتمان خۆی لەپەژارەدا ئەبینێتەوە . حەقیقەتی کوێخاو کوڕە هەژارەکەی بۆ دەرئەکەوێ . هەست ئەکا لەتەنگانەدا کوێخاو ئەو چینەی نوێنەرینە دەست بەرداری ئەبن و ئامادەنین لەپیناویدا قوربانی بدەن . بەڵام کوڕە هەژارەکە چونکە ئامادەیە نرخی خۆشەویستییەکەی بۆ نیشتمان هەرچی بێت بیدات ، لە

ئەو پەڕی کارەساتباوەش بۆ نیشتمان ئەکاتەوەو قارەمانانە بەرگری لێ ئەکات .

رەفتاری پالەوانەکانو چۆنێتی گەشەسەندنو کۆتایی هاتنی رووداوەکە ئەوە ئەدەن بەدەستەوە کە بزووتنەوەی نەتەوایەتی لە ئەنجامی گەشە سەندنی رژێمی سەرمایەداریەوە سەری هەلداوە . بۆیە بزووتنەوەی نەتەوایەتی لەگەڵ هەردا دژی رژێمی سەرمایەداری لەخەبات دایە ، ئەمەش کاکڵەی ئەو پەیوەندیە جەدەلییەی نێوان خەباتی چینایەتیو نەتەوایەتییە ، لەبەر ئەوەشی لەهەموو وولاتێکی ژێر دەستەدا ئیمپریالیزم کەدوا قۆناغی سەرمایەدارییە بنکەی خۆی هەیە کە بۆرژووای بازرگانیو دەرەبەگو هەندێ توێژی ترن ، ئەمانەش هەرگیز سوور نین لەسەر خەبات دژی ئاغاکانی دەرەوەیانو ناتوانن کۆتایی بەدەسەڵاتی ئیمپریالیزم لەووڵاتەکەی خۆیاندا بهێنن ، بۆیە برینی ئەو ڕێگەیە ـ کۆتایی هێنان بەدەسەڵاتی ئیمپریالیزم ـ کەوتۆتە ئەستۆی چەوساوەکان ، تاقیکردنەوەی ڤێتنامییەکان راستی ئەم بۆچوونە ئەسەلمێنێ .

کاکە مەم چ پالەوان ، چ رووداو لە شێوەی رەمزا پێشکەشیان ئەکات ، بەلام ئەم دیاردەیە کە زۆربەی چیرۆکەکانی کاکە مەمی گرتۆتەوە کارێکی وای نەکردووە خوێنەر سەری لە مەبەستەکانی دەرنەچێ ، ئەرەستۆ ئەلێ : ( سیفەتی سەرەکی نووسین ئەوەیە روونو ئاشکرا بێت بەمەرجێ ساکار نەبێ )(٢٥). یەفتۆ شینکۆش ئەلێ : ( هەوڵ ئەدەم شیعرەکانم وابنووسم خوێنەرێکی ئاسایی تێیان بگات ، رۆشنبیرێکی گەورەش بەساکاریان نەزانێ . ) کاکە مەم لەم بوارەشدا بەتایبەتی لەم دوو چیروکەیدا وەستایانە رەمزی رەخساندووە بۆ وێنەکێشانی هەر پالەوانو رووداوێك .

لەهەر کۆمەڵگایەکدا شێوازی بەرهەم هێنانی سەرمایەداری سەروەر بێت هەموو شتێ لەخزمەتی بەرهەم هێنانی شتومەك دایە بەمەبەستی زیاد کردنی قازانجو تەنانەت ئینسانو هەموو بەهایەکی ئینسانیش وەك شتومەك مامەڵەیان لەگەڵ ئەکرێ . بۆیە مرۆڤ لەئەنجامی ئەو کارە ساکارەی دژی خواستو ئارەزووی خۆی پێی ئەسپێررێو تەنیا لەبەر دابین کردنی هۆیەکانی ژیان پێی هەڵئەسێ ئەبێتە پارچەیەکی بچووك لە ئامێرێکی گەورەدا ، ئەمەش هۆی سەرەکی هەست کردن بە نامۆیە ، بیرۆکراتییەت یش کە یەکێکە لە رووکارەکانی قۆناغی سەرمایەداری ، ( رۆڵێکی کاربڕ ئەبینێ لە دابڕ کردنی مرۆڤ لە کۆمەڵەکەی ، چونکە بیرۆکراتییەکان پەیوەندی مرۆڤانەیان لەگەڵ کەسدا نیەو تەنیا کۆمەڵێ فایلیان هەیە ، بۆیە مرۆڤ ئەبێتە فایلێکو ئەوی بشمرێ بەژمارەی فایلەکەیدا ئەی ناسنەوە . )(٢٦)

لەچیرۆکی شیزۆفرینیای رەئووف حەسەن دا(٢٧) سەرۆکی بەشێك لەکارگەیەکدا کە باوکی سەرەك تیرە بووە . خۆیشی هەڵسووکەوتی دۆنکیشۆتانەیەو درێغی ناکا لە جنێو پێدان و شەڕ فرۆشتن بە کرێکاران . ئەم سەرۆکی بەشە زیاتر گەڕ لە کرێکارێك ئەئاڵێنێو دواجار نان بڕاوی ئەکا ، لەلایەکی ترەوە فەرمانبەرێك کە فایلەکانی لەبەر دەستدایە هەمیشە بەناو فایلەکاندا دێتو ئەچێو خۆی وەك سیسرکێکی زل دێتە بەر چاو ، ئەم فەرمانبەرە کە سەرنجی فایلی سەرۆکی بەشەکە ئەدات ئەبینێ بەپێی راپۆرتی دوکتۆرەکان تووشی شیزۆفرینیا هاتووە کە ئەمەیان لە راژەی گەشەسەندنی رووداوەکەدا نیە چونکە لەواقیعدا سەرۆکی بەش کە دژایەتی کرێکاران ئەکا ، لەبەر ئەوە نیە نەخۆشە بەڵکو بەوپەڕی ووشیارییەوە ئازاریان ئەداو سەگێکە پاسی بەرژەوەندی چینایەتی خاوەن کارگەکە ئەکا ، هەڵوێستی کرێکارەکەش سەبارەت بە دەرکردنەکەی تەنیا نووسینی نامەیەکە بۆ کارگەکە تێیدا هەڕەشەی ئەوە ئەکا ئەگەر نەی گەڕێننەوە سەر کارەکەی ئەوا منداڵانی گەڕەك هان ئەدا بەهووها کێشان دوای سەرۆکی بەشەکە بکەون . ئەگەر چیرۆکنووس لەبری ئەم هەڵوێستە تاکەکەسییە کارێکی بکردایە کرێکارانی کارگەکە پشتی هاوڕێکەیان بگرتایە بەهەر جۆرێ لەجۆرەکانی تێکوشان ، ئەو کاتە چیرۆکەکە ئەبووە نموونەیەکی چاکی ئەدەبی ریالیزمی سۆشیالیست .

( لەم سەردەمەدا هونەر نابێتە هونەرێکی بڵاو گەورە ئەگەر بەشێوەیەکی راستەو خۆ یان ناڕاستەو خۆ بەشداری نەکا لەرزگار بوونی کارگەراندا لە دەست کۆیلایەتی سەرمایەداری)(٢٨) . لەگەڵ ئەم سەرنجەشدا هێشتا ئەڵێم شیزۆفرینیا هەوڵێکی سەرکەوتووانەیە بۆ نووسینی ئەدەبێ کە رەنگدانەوەی باری کۆمەلایەتی کارگەران بێتو مۆری تاوانباری نابێت بەناوچاوانی چەوسێنەرانەوەو سەرەکی ترین رووکاری تێڕوانینی مەتریالیزمی مێژوویی تێدا رەچاو کرابێت کە دەرخستنی زۆرانبازی چینایەتییەو بەشداری کردنە لە دروست کردنی ویژدانی چینایەتی کارگەراندا(٢٩) . جگە لەمەش چیرۆکەکە رووبەرووی پەتایەکی کوشندە بۆتەوە کە مرۆڤی لە کۆمەلگای سەرمایەداریدا رووت کردۆتەوە لە مرۆڤایەتی خۆی، رزگار بوونش لەو پەتایە بەندە بەگۆڕ کردنی شێوازی بەرهەم هێنانی سەرمایەدارییەوەو بنیات نانی شێوازی بەرهەم هێنانی سۆشیالیستی لە جێگەی .

( هەموو شاکارە ئەدەبییەکان ئەوانەن کە رەنگدانەوەی واقیعی میللەتێکن لە سەردەمێکی مێژوویی دیاری کراودا )(٣٠). گەورەیی بلزاك ئەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی سکرتێری کۆمەلگای فەرەنسایی بوو لەسەردەمەکەی خۆیدا پۆشکین لەبەر ئەوەی

ئه‌نسکلۆپیدیای میلله‌تی رووس بوو ، ئه‌مری مۆگه‌ر کرد . ره‌ئووف حه‌سه‌نیش به‌ به‌رهه‌مه‌کانیدا ئه‌ناسرێته‌وه‌ سه‌ر به‌کام سه‌رده‌مه‌و ته‌عبیر له‌ ئازارو ئاوانی کام میلله‌ت ئه‌کا . ئه‌مه‌ش هۆی سه‌ره‌کییه‌ بۆ ده‌رباز بوونی هه‌ر به‌رهه‌مێك له‌چوار چێوه‌ی نه‌ته‌وایه‌تیو وه‌رگرتنی مۆرکێکی جیهانی . ره‌ئووف حه‌سه‌ن له‌ ( چلێ ئه‌رخه‌وان ) و له‌ ( گلۆپه‌ ره‌نگاو ره‌نگه‌کان ) دا(٢١) توانیوێتی له‌ رێی په‌ژاره‌و ئومێدی پاڵه‌وانه‌کانییه‌وه‌ ته‌عبیر له‌ په‌ژاره‌و ئومێدی میلله‌ته‌که‌ی بکاتو ویژدانی راسته‌قینه‌ی سه‌رده‌مه‌که‌ی بێت . بۆیه‌ به‌ دڵنیاییه‌وه‌ ئه‌ڵێم ره‌ئووف له‌ سنووری ته‌نگی بازنه‌ی خه‌مه‌ رۆمانسی‌یه‌کانی خۆی ده‌رباز بووه‌و قاوغی ته‌سکی خودی خۆی شکاندوه‌و په‌ای بۆ کێشه‌ گه‌وره‌که‌ی میلله‌ته‌که‌ی هاویشتووه‌ . ئه‌م خۆبه‌ستنه‌وه‌یه‌ش به‌ئازارو ئاواتی میلله‌ته‌وه‌ هه‌وێنی په‌ڕینه‌وه‌ی چیرۆکه‌کانێتی بۆ جیهانێکی به‌ر بلاوتر . چونکه‌ خوێنه‌ر هه‌ست ئه‌کا له‌هه‌ر شوێنێ چه‌وساندنه‌وه‌ بژی . ئه‌ریمانو په‌روین به‌ره‌نگاری ئه‌بنه‌وه‌ . له‌هه‌ر شوێنێ بۆرژوا خاوه‌ن ده‌سه‌ڵات بێت چاره‌نووسی گێلاسو رێبوار دووباره‌ ئه‌بێته‌وه‌ . به‌ڵام له‌سه‌ر بناغه‌ی ئازاری ئه‌مڕۆیان سبه‌ینێ کۆشکی ئاوات به‌رز ئه‌بێته‌وه‌. به‌ڵام له‌هه‌ر شوێنێ چه‌وساندنه‌وه‌ هه‌بێ ته‌قینه‌وه‌ روو ئه‌دا . ره‌ئووفیش له‌ دوو چیرۆکه‌دا ئه‌وه‌مان پێ ئه‌ڵێ .

له‌به‌ر رۆشنایی ئه‌و سه‌رنجانه‌دا که‌ ده‌رباره‌ی پاڵه‌وانو رووداوی چیرۆکه‌کان ده‌رم بڕین . وا هه‌ست ئه‌که‌م به‌پێی توانا وه‌ڵامی پرسیاری ( چیرۆکنووسانی کورد چی ئه‌ڵێن ) م دایه‌وه‌ بۆیه‌ به‌م چه‌ند خاڵه‌ کۆتایی به‌ باسه‌که‌ ئه‌هێنم :

**١ ـ له‌ گۆڕه‌پانی چیرۆکی کوردیدا ئێستا ئه‌ده‌بی سه‌روه‌ر ئه‌ده‌بێکی به‌ره‌ڵلاو نامافووڵو وجودیو فرۆیدییه‌ ، ئه‌ده‌بێکه‌ دووره‌ له‌ کێشه‌ی سه‌ره‌کیو ئاواتو خواستو خه‌مو ئازاری کۆمه‌ڵانی خه‌ڵکه‌وه‌ ، به‌ڵام به‌رامبه‌ر ئه‌م ئه‌ده‌به‌ ئه‌ده‌بێکی ره‌سه‌نیش هه‌یه‌ که‌ ره‌نگدانه‌وه‌ی ئازارو ئاواتی میلله‌ته‌که‌یه‌و ته‌عبیر له‌گیانی سه‌رده‌مه‌که‌ ئه‌کاتو ئاوێنه‌یه‌کی راستگۆی ویژدانی خه‌ڵکه‌که‌یه‌ .**

**٢ ـ نووسه‌ر تاچه‌ند بتوانێ سه‌رکه‌وتووانه‌ وێنه‌ی پاڵه‌وانه‌که‌ بکێشێو رووداوه‌که‌ بچنێو په‌یوه‌ندی نێوان بخاته‌ روو ئه‌وه‌نده‌ سه‌رکه‌وتن به‌ده‌ست ئه‌هێنێ ، چونکه‌ پاڵه‌وانو رووداو وه‌ك دوو ره‌گه‌زی گرنگو بنچینه‌یی رۆڵێکی کاریگه‌ر ئه‌بینن له‌بینای هه‌موو چیرۆکێکدا ، هێنده‌ی ره‌ئووف حه‌سه‌ن زیره‌کانه‌ به‌ناخی پاڵه‌وانه‌کانیدا شۆڕ ئه‌بێته‌وه‌ ، هێنده‌ش کاته‌مه‌م ووشیارانه‌ رووداوه‌کان ئه‌چنێ به‌ڵام لای زۆربه‌ی ئه‌وانیتر پاڵه‌وان کارتۆنییه‌و رووداویش قه‌ناعه‌ت به‌خوێنه‌ر ناکا .**

**٣ ـ که‌ نووسه‌ری سه‌رمایه‌ کۆچی دوایی کرد نزیکترین هاوڕێی که‌ له‌سه‌ر مه‌زاره‌که‌ی ووتارێکی ئه‌خوێنده‌وه‌ ووتی : ئه‌وه‌ی لێره‌دا بۆ دوا جار چاوی لێکناوه‌ ، فیکرێکی وای هێنایه‌ ئاراوه‌ هه‌موو دانیشتووانی سه‌ر زه‌مینی دابه‌ش کرد به‌سه‌ر دوو سه‌نگه‌رداو له‌ یه‌کتری کردن به‌ دوژمن ، به‌ڵام خۆی تامرد یه‌ك دوژمنی شه‌خسی نه‌بوو . منیش له‌به‌ر رۆشنایی ئه‌و فیکره‌دا ئه‌نووسم .**

**سه‌رچاوه‌کان :**


**١ ـ الفن والتصور المادى للتاريخ بليخانوف ل ٢١١ .**
**٢ ـ رۆژی کوردستان ژماره‌ی تایبه‌ت به‌ شانۆو چیرۆك .**
**٣ ـ الاديب المعاصر ژماره‌ (٢٧) ی ساڵی ١٩٧٨ .**
**٤ ـ به‌یان ژماره‌ (٦٧) .**
**٥ ـ الثقافه الاجنبيه ژماره‌ ( ١ ) .**
**٦ ـ نووسه‌ری کورد ژماره‌ ( ٤ ) ساڵی ١٩٨٠ .**
**٧ ـ ریمارك للحب وقت للموت وقت به‌رگی دووه‌م ل ٩٠ .**
**٨ ـ نووسه‌ری کورد ژماره‌ ( ٥ ) ساڵی ١٩٨٠ .**
**٩ ـ نووسه‌ری کورد ژماره‌ (٦) ساڵی ١٩٨١ .**
**١٠ـ به‌یان ژماره‌ ( ٥٤ ) .**
**١١ـ اسس علم الجمال به‌رگی یه‌که‌م ل ٣٧٦ .**
**١٢ـ الطريق والحدود يوسف عبدالمسيح ثروت .**
**١٣ـ مردوو خه‌ون نابینێ عبدالله سه‌راج ل ٢٤ .**
**١٤ـ هه‌مان سه‌رچاوه‌ ل ٤٥ .**
**١٥ـ سه‌رچاوه‌ی پێشوو ل ٥١ .**
**١٦ـ به‌یان ژماره‌ ٦٧ .**
**١٧ـ فن الشعر ارسطوطاليس ل ٦٩ .**
**١٨ـ بۆ ئه‌و چیرۆکانه‌ی عبدالله عزیز خالد بڕوانه‌ :**
**١ ـ په‌رستگا ٢ ـ بابه‌ نۆئێل تۆراوه‌ ؟**
**١٩ـ کرێره‌وه‌ری ل ٤٧ .**
**٢٠ـ به‌یان ژماره‌ (٦٧) .**
**٢١ـ فن كتابة الاقصوصة ل ٨٩ .**
**٢٢ـ رۆژی کوردستان ژماره‌ (٦٢) .**
**٢٣ـ بازنه‌ که‌ که‌ مه‌می بۆتانی ل ٦٥ .**
**٢٤ـ هه‌مان سه‌رچاوه‌ ل ٧٢ .**
**٢٥ـ فن الشعر ارسطوطاليس ل ٦١ .**
**٢٦ـ الاشتراكية والفن ارنست فيشر ل ١٣٥ .**
**٢٧ـ سبه‌ینێ باوکت دێته‌وه‌ ره‌ئووف حه‌سه‌ن ل ٨٧ .**
**٢٨ـ اسس علم الجمال به‌رگی یه‌که‌م ل ٣٨٨ .**
**٢٩ـ الادب والفن فى الاشتراكية گۆڕینی عبدالرحمن حنفى ل ١٦ .**
**٣٠ـ هه‌مان سه‌رچاوه‌ ل ١٠٩ .**
**٣١ـ سبه‌ینێ باوکت دێته‌وه‌ ره‌ئووف حه‌سه‌ن ل ٥١ ، ٦٨ .**

# کاروانی رووناکبیری لە سلێمانی



ئاسۆس

ئامادەی کردووە

### « میهرەجانی نالی »

لە رۆژانی سێو چواری دوا مانگی سالی ١٩٨٢، بەڕێوەبەرێتی رۆشنبیری جەماوەر لە هۆلی یانەی ئەزمر میهرەجانێکی خنجیلانەی بۆ یاد کردنەوەی شاعیری مەزن (نالی) سازکرد، ژمارەیەکی زۆر لە ئەدیبانو رووناکبیرانی سلێمانی بەشدارییان تێدا کرد، بۆیەکەم جاریش دەستەیەك لەو خوشكو برایانەی لە قوتابخانە ناوەندیو ئامادەییو سانەویەکانا زمانی کوردی دەڵێنەوە هاوبەشی بوون، هەروەها لە هەولێرەوە بەرێزان مامۆستایان عیززەددین فەیزیو دکتۆر مارف خەزنەدارو کەریم شارەزاو عەبدول غەنی عەلی یەحیاو مومتاز حەیدەری، لە بەغداشەوە مامۆستایان دکتۆر احسان فۆادو موحەممەد بەدریو سەلاح شوانو حسین جافو عەبدوللا عەبباسو مەحمود زامدار ئامادەی یادی شاعیری شارەزوور بوون

لە سەعات دەی رۆژی هەینی ٣/١٢/٩٨٢ کاك ئازاد عەبدول واحید میهرەجانەکەی بە وتەیەکی بەخێرهاتن کردەوە، ئەمجا کاك موحەممەد ئەمین پێنجوینی بەڕێوەبەری رۆشنبیری جەماوەر، وتارێکی پێشکەشی کرد تێیدا وتی : نالی زۆر مەزنە، بە چەند باسێك ناتوانرێ تینویەتی ئەوانە بشکێنرێ کە شەیدای شیعری نالین، ئەمجا کاك حەمە ئەمین سەرژمێرێکی ئەو کۆڕە ئەدەبیانەی کرد کە لەوەوبەر بۆ گۆرانو بێکەسو قانیعو موفتی پێنجوینی سازیان کردوە جگە لەو شانۆگەریانەی بە پێی دەرفەت پێشکەشی کراون، ئەمە سەرەڕای چەندەها کۆڕی ئەدەبی تر بۆ لێکۆلینەوەو باس، لە کۆتاییدا وتی :

وەك لە سەرەتاشەوە وتم دووبارەی دەکەمەوە کە ـنالیـ بەم چەند کۆڕە خنجیلانانە لێمان خۆش نابێ چونکە لە ڕاستیدا ئەو پێویستی بە چەندەها لێکۆلینەوەو باسی وا هەیە کە شایانی ئوترووحەی زانکۆکان بن

### «نالی لە تەرازووی رەخنەدا»

یەکەم باس بەو ناونیشانە لە لایەن مامۆستا رەئوف عوسمانەوە پێشکەشی کرا. باسەکە نزیکەی دوو سەعاتی خایاند، کورت کردنەوەو پچڕ پچڕ کردنی بەلای منەوە تینویەتی ئەوانە ناشکێنێ کە مەبەسیانە باسەکە بخوێننەوە، ئەوەندە دەڵێین سەرجەمی بریتی بوو لەو سەرنجو تێبینیانەی خۆی دەربارەی (نالی لە کلاورۆژنەی شیعرەکانیەوە) لە نووسینی مامۆستا موحەممەدی مەلا کەریم، لەوانە مەسەلەی تەمەنی نالی، وەسفی سەربازەکانی بابانەکان، چوونی بۆمیسر، قەدریو جەبری، تا ... دوای تەواو بوونی باسەکە ئەم مامۆستایانە بەروودوا گفتوگۆیان لەسەر کرد : رەئوف بێگەرد، سەلام مەنمی، کەریم شارەزا ، ئەکرەم ئەحمەد ، حەسیب قەرەداخی ، دکتور احسان فۆاد ، حەمە شوان رەسول ، مەحمود زامدار، رەئوف زوهدی ، رەئوف ئالانی ، نوری عەبدوللا .

بەڕێوەبەری ئەم کۆڕە مستەفا سالح کەریم بوو سەرەتا وتارێکی پێشکەش کرد تیایدا وتی : « وەك دەیزانن ووشەی رەسەنی کوردی پێشرەوی کاروانێکی کۆل نەدەرە ، کاروانێ کە لە مێژە رێگایەکی سەختو هەورازی لەبەرە ، رێگا دوورە ، هەلدێرە .. لە کاتێکدا کرێوەی بەفرو گڤەی زریان زۆر بۆ کاروان دەهێنێو دەیەوێ رێگای لێ هەلە بکات .. پێشرەوانی کاروان کە هەمیشە هەول بۆ بەهارێك دەدەن گولاڵە سوورە دەشتو دەرمان ئال بکات ، درەختە جوانەکانمان سەوزبێ تا لەژێر سێبەریا پشوویەك بدەنو پڕ بە گەرویان فوو بە شمشالی شوانەی قەد پالەکانا بکەن بە ئاوازی کوردی گۆرانی بۆ میلەت بلێن . بەلام ئەگەر پایزو زستان تەمەنی بەهاریان کور ت کرد ، کانیاوەکان نەتەقینەوە ، درەختەکانیش سەوز نەبونەوە روناکبیری ئازای لە کاروان دوا نەکەوتوو دەستەو ئەژنۆ دانانیشێو لە هەر شوێنێکدا ماوەبێ بە نیازی خزمەت کردنی ئەدەبی کوردیو نەتەوەی کورد لائەداو دەنگی خۆی بەرز ئەکاتەوە . . وا ئەم جارەش لە شاری سلێمانی لاماندا بۆ ئەوەی :

**ڕێیی بێ بۆ میشکمان خۆش کەن**
**زمانمان بە کوردی گوش کەن**

پاش ئەوەی بە شیعرێکی نالی کۆتایی بە وتەکەی هێنا، مامۆستای خاوەن باسی پێشکەش کرد .

### « دکتور مارف خەزنەدارو پیرو مریدی لەگەڵ نالیدا »

پاش نیوەرۆی هەمان رۆژ مامۆستا محمد امین پێنجوینی بەڕێوەبەری کۆڕ بوو لە پێشکەش کردنی دکتۆر مارف خەزنەدارا وتی : بەڕێز دکتۆر مارف بابەتێکی دەست نیشان کراوی بۆ ئەم کۆڕە هەلنەبژاردوە بەلکو واهان بە باش ـ زانی کە راستەوخۆ لە گەلیا بکەوینە گفتو گۆ ، ئەو پرسیارانەی سەبارەت بەم کەلە شاعیرە بە بیرمانا دێت بەرەو رووی دکتۆر خەزنەداری دەکەینەوە ، لە وەلامی پرسیارەکانا دکتۆر وتی : نالی دەریایەکەو لەبن نایەت ، کەس خەمی ئەوەی نەبێ فریا ناکەوێ ، هەر کەسێ بیەوێ خۆی لەم بوارە بدات ماوە زۆرە چونکە نالی مولکی تاکە کەسێك نیە ، نالی شاعیری کوردەو مولکی هەمو کوردێکە ، ئەمجا بە درێژی باسی ئەوەی کرد چۆن نالی ناسیوە ( بەهۆی شیعرەکانیەوە ) ، وەچۆن بە دوای سەرچاوەکانیا وێڵ بوە ، دوای تەواو بوونی پرسیارەکانی پێنجوینی،ژمارەیە لە ئەدیبانو روناکبیران وەك رەؤوف بێگەردو رەؤوف عوسمانو مومتاز حەیدەریو کەریم شارەزاو مەحموود زامدارو نوری قادری کا مەلا پرسیاریان ئاراستەی دکتۆر کردو ئەویش وەلامی دانەوە، خەریك بوو کات تێدەپەریو پرسیارێکی

زۆریش کرابوو ، ئیتر ماوەی ئەوە نەما لەوە زیاتر درێژە بەو کۆڕە بدرێ .. لەگەڵ ئەوەشدا دکتۆر مارف بەلێنیدا کە وەلامیان بەتایبەتی بۆ بنێرێتەوە .. بەلام بەو مەرجەی کاك مومتاز بۆیان « کۆپی » بکات .

### « زمانی ئەدەبی یەکگرتوو لە شیعری نالیدا »

سێیەم باسی میهرەجان بەو ناونیشانە ی سەرەوە شاعیر مامۆستا کەریم شارەزا پێشکەشی کرد ، باسەکەی نزیکەی ٣٠ لاپەرەی فولسکێپ بوو. سەرەتا پێشەکیەك دەربارەی زمانو خەسیەتەکانی،ئەمجا ئەو گۆڕانکاریەی لە سەردەمی بابانەکانا بەسەریا هەت بە تایبەتی لە دەوری ئەورەحمان پاشای بابانا ئەمجا هاتە سەر ستانداری زمانو گەشە کردنی لەو دەمەدا ، ئەمجا هاتە سەر دروست بوونی بزوتنەوەی ئەدەبیو نلوبانگ پەیدا کردنی نالی وەك شاعیرێکی کلاسیکی هەروەها سالمو کوردی، لە دوایدا بە وردی باسی زمانی ئەدەبی یەکگرتووی لە شیعرەکانی نالیدا کرد ، بەڕێوەبەری ئەم کۆڕە شاعیر مامۆستا عەلی شەونم بوو .

### « دووەم رۆژی میهرەجان .. شەممە ٤ـ١٢ـ١٩٨٢ »

١ ـ لەسەرەتادا مامۆستا کەمال رەؤوف ئەو پارچە بەخشانە نایابەی پیرەمێردی خوێندەوە کە لە ستایشی (نالی)و دیوانەکەیا وتویەتی لەگەڵ جوانی بەخشانەکەدا کاك کەمالیش زۆر بەسۆزەوە خوێندیەوە .

٢ ـ ئەمجا بەڕێوەبەری کۆڕ کاك ئازاد عەبدول واحید کاك مەحمودی زامداری پێشکەش کرد لە کورتە باسێکا سەبارەت بە شیعرێکی نالی . "

٣ ـ کاك رەؤوف بێگەرد لە پێشکەش کردنی شێرکۆ بێکەسی شاعیرا وتەیەکی خوێندەوە تێیدا وتی : نالی واتە دامەزرێنەری قوتابخانەیەکی شیعری نوێی کوردی ، شاعیرێ بۆ یەکەم جار زمانی شیعری نەتەوەکەی بەرانبەر زمانە هەرە فراوانو رەواج سەندوەکانی ئەو سەردەمە داناوە ، نالی نمونەیەکی راستەقینەی ژیانی ئەو سەردەمەی میلەتەکەیشی بوە ، شیعرەکانی کردۆتە چەپکە گولێكو لە بەرۆکی سوپای بەبەی داوە . کە تاقە بینایەکەی کوێر بووەوە ، نالیش کۆستی کەوتو بوە هاوەلی فرمێسكو ئاوارەیی . هاوارەکەی نالی لە زەنگی ئەو کلێسانە دەچێ کە لە ناو زریانو رەشەبای سەختا وون دەبن ،دەرۆنو دەگەرێنەوە دەبنە بەشێکی زریانەکە.

ئێستاش شاعیری هەلکەوتوومان شێرکۆ بێکەس زایەلەو هاوارە مەزنەکەی نالیمان بۆ دەگێرێتەوەو دیسان برینە سارێژ نەبوەکانی نالیمان دەهێنێتەوە پێش چاو .

کاك شێرکۆ شاعیرانەو بە دەنگێکی کاریگەر ئەو شیعرەی نالی کە بۆ سالمی ناردبوو خوێندەوە .

**« قوربانی تۆزی ڕێگەتم ئەی بادی خۆش مورور**
**وەی پەیکی شارەزا بە هەموو شاری شارەزوور » .**

٤ ــ دوای ئەم شیعرە ، مامۆستا عومەر عەبدول ڕەحیمیش شیعرە نایابەکەی سالم کە وەڵامی شیعرەکەی نالیە پێشکەشی بە دانیشتوان کرد .

٥ ــ بەهان دانی دکتۆر مارف خەزنەدارو خواستی ئەدیبان دکتۆر احسان فؤاد شیعرێکی خۆی کە پێش ماوەیە لەمەوبەر بۆ نالی وتوە ، ئەو شیعرەی بۆ خوێندینەوە کە جێی ستایش‌و ڕەزامەندی بوو .

بەم شێوەیە میهرەجانەکە کۆتایی پێهات بە هیوای ئەوەی لە کۆڕی [ مەحوی ]دا یەك بگرینەوە .

## [ سۆزی شیعرو دەنگی چیرۆك لە شاری هەڵەبجەدا ]

لە شارە خنجیلانەکەی ئەحمەد موختار جافا ، گەلێك چالاکی ئەدەبی پێشکەش کراوە . وەك زانیمان ماوەی دوو ساڵ ڕەنگە پتریش بێ کە مەڵبەندی [ ڕۆشنبیری جەماوەر ] لە هەڵەبجەناو بەناو کۆڕی ئەدەبی سازکردوەو جار جارەش لە سلێمانیەوە نووسەرانمان بەشداری ئەو کۆڕانەیان کردوە .

وەك لەیاد بێ لە زنجیرەی چالاکیەکانی ساڵی ڕابوردویانا کۆڕێکی تایبەتیان بۆ چیرۆکنووسان ساز کردبوو ، لەوانەی لە سلێمانیەوە بۆ چیرۆك خوێندنەوە بۆ ئەو کۆڕە چوو بوون مامۆستایان : جەلال مەحمود مەلا عەلی‌و سەلام مەنمی‌و موحەممەد فەریق حەسەن‌و زاهیر ئەحمەد سەوز .

لە وەرزی ئەم ساڵیشا سێ کۆڕ بۆ شیعر خوێندنەوەو کۆڕێکیشی بۆ چیرۆك پێشکەش کراوە .

١ ــ لە کۆڕی یەکەمی شیعرا سیروان عەلی‌و چیمەن قەرەداخی‌و حەمە ئەمین شیعریان تیا خوێندەوە ، مامۆستا کەریم بەڕێوەبەری کۆڕ بوو .

٢ ــ لە دوەم کۆڕا کە بۆ یادی خوا لێخۆشبوو کاردۆخی شاعیر ساز کرابوو ئەم شاعیرانە بەشداریان کرد : خورشیدە بابان ، جەلال عازەبانی ، محمد خامۆش ، جەمیل حاجی کەریم ، ئیبراهیم هەورامانی ئەم کۆڕە سیروان عەلی ڕەزا هەڵی دەسوڕاند .

٣ ــ سێیەم کۆڕی شیعر کە شاعیری لاو بارزان هەستیار بەڕێوەی دەبرد ئەم شاعیرانە شیعریان تێدا خوێندەوە :

خورشیدە بابان ، چیمەن قەرەداخی ، جەمال محی‌الدین ، سەباح جەمال ، جەلال عازەبانی .

ئەوەی شیاوی باسە شێرکۆ بێکەسی شاعیرو ڕەئوف بێگەردی چیرۆکنووس بۆ هاوبەشی کردن بە تایبەتی بانگ کرابوون ، وە لەسەر خواستی بەشدارانی کۆڕەکە ، یەکەمیان بەشیعرێك‌و دوەمیان بە دەربڕینی چەند سەرنجێك سەبارەت بە سەرجەمی کۆڕەکەو بە شیعرەکان ، بەشداریان کرد .

٤ ــ لە کۆڕی چیرۆکیشا دوو چیرۆك پێشکەش کرا لە لایەن عەبدوڵلا دەروێش کەریم‌و کەریم حەسەنەوە .

واش بەنیاز بوون کۆڕێکی تری چیرۆك بۆ کاك حەمە فەریق حەسەن ساز بکەن ، بەڵام لەبەر تەواو بوونی وەرزی ڕۆشنبیریان مەڵبەند ئەو کۆڕەشی دوا خست بۆ وەرزی نوێیان .

## [ کۆڕێکی فراوان سەبارەت بە وەرگێڕان ]

ڕۆژی ٦ــ١٢ــ١٩٨٢ لە هۆڵی نەقابەی مامۆستایان ژمارەیە لە ئەدیبان‌و ڕوناکبیران سەرەڕای مامۆستایانی مێژوو ، جوغرافیە ، پەروەردەی نیشتمانی هەروەها سەرۆکی نەقابەی مامۆستایان‌و سەرپەرشتیارە پسپۆڕەکانی هەولێرو سلێمانی سەبارەت بە وەرگێڕانی وانەکانی کۆمەڵایەتی کۆبوونەوە لەسەرەتادا جێگری ئەمینداری گشتی پەروەردەو بەڕێوەبەری گشتی پەروەردەی سلێمانی ئەوەیان ڕاگەیاند کە بڕیار دراوە تێکرای هەموو وانەکان جگە لە عەرەبی‌و ئینگلیزی ــ لە هەموو قۆناغەکانی سەرەتایی‌و ناوەندی‌و ئامادەییدا بە کوردی بخوێنرێت ، ئەمجا وتوویژ گەیشتە ئەو پلەیەی ئاخۆ مەسەلەی وەرگێڕان نابێتە کۆسپ بۆ ئەم ساڵ لەڕێی بەجێ هێنانی ئەم بڕیارەدا ، بەڵام تێکرا ئەو ئەدیب‌و ڕۆشنبیرانەو ئەو پسپۆڕانەی قسەیان لەسەر ئەوە کرد ئامادەیی خۆیان پیشاندا کە بە شەونخونیش بێ ئەم ئەرکە پیرۆزە ڕا ئەبەڕێنن ، ئەوانەی لەم کۆڕەدا بەرودوا وتەیان هەبوو ، وە پێشنیازیان پێشکەش کردو لەگەڵ لێپرسراوانا مەسەلەکەیان شی کردەوە ئەم مامۆستایانە بوون :

مستەفا سالح کەریم ، موحەممەد سالح سەعید ، حەسەن جاف ، کەریم شێخانی، ڕەئوفی ئەحمەد ئالانی ، فؤاد عیززەت مستەفا ، مەحموود خەزنەدار ، نوری عەبدوڵلا ، شەفیق سابیر ، موحەممەد ڕەشید مەحموود ، ئەنوەر فەخری واسیف، نەسرین مستەفا مەزهەر،کەریم زەند ، عەبدول ڕەحمان سالح ئەمین ، تەحسین ئەحمەد ، ئەنوەر سلیمان ، موحەممەد کەریم سەرەنجام تێکرای ئامادە بووان لەسەر ئەم خاڵانە پێك هاتن :

١ ـ هەر لە رۆژی سێشەممەی ٧ـ١٢ـ١٩٨٢ وە مامۆستایانی وانەی مێژوو ، جوغرافیە ، پەروەردە ، ئاگادار بکرێن کە ئەو دەرسانە بە کوردی بلێنەوە ، پوختەی هەر دەرسەیان بە کورتی‌و لە چەند خاڵێکدا بە قوتابیان بنووسنەوە.

٢ ـ دەست بە دانانی لیژنەی وەرگێڕان بکرێ ، بەو مەرجەی ئەندامانی ئەم لیژنانە لە شارەزاو پسپۆڕو کارامەکانی پێك بێن ، مەسەلەی دۆستایەتی‌و ناسیاوی دەوری جاران نەبینێتەوە .

٣ ـ بۆ دەست نیشان کردنی ناوی ئەندامەکان پێویستە لە هەر لیژنەیەکدا مامۆستایەك لەو مامۆستا سەرکەوتوانەی تیابێ کە خۆی دەرسەکە دەڵێتەوە ، جگە لەو مامۆستا شارەزایانەی زمانی کوردی کە ئێستا کۆمەڵایەتی‌یان پێ سپێرراوە ، هەروەها بۆ یەك خستنی شێوازی گۆڕین‌و ئێك دانەبڕاندنی وەرگێرانەکە دەبێ هەر لیژنەیەك یەکێك لە ئەدیبە شارەزاو لێهاتووەکانی تێدابێ .

٤ ـ لەگەڵ دەست پێکردن بە وەرگێڕان ، مەلزەمە بەدوای بەدوای مەلزەمەدا کۆپی بکرێ‌و بەسەر قوتابخانەکانا دابەش بکرێ ، نەوەك چاپ کردنی کتێبەکان دوا بکەوێ .

٥ ـ پێویستە لیژنەکان ئاگادار بکرێن کە بڕیار دەرەکانیان لە ناو خۆیانا کۆبوونەوە بکەن تا شێوازیان یەك بێ‌و ناکۆکی لە زاراوەکانیانا بەدی نەکرێ .

٦ ـ لە بەغداو هەولێرو سلێمانی‌و دهۆك ئەوانەی تاقی‌کردنەوەیان لەبوارەدا هەیە ، بۆ لیژنەی وەرگێڕان دەست نیشان بکرێن .

لە کۆتاییدا بەڕێوەبەری گشتی پەروەردەی سلێمانی بەتایبەتی سوپاسی
ئەو ئەدیبانەی کرد کە بەشداری کۆڕەکە بوون‌و بەو تین‌و گوڕەوە
ئامادەیی خۆیان بۆ هەڵسوڕاندنی ئەم کارە پیشاندا .

## چاو پێکەوتنی ئەم جارەمان

حەسیب قەرەداخی ، یەکێکە لە شاعیرە ناسراوەکانی ئەم سەردەمە خاوەنی دیوانی [ فەرهەنگی خەم ] ە، لە زۆربەی گۆڤارو رۆژنامە کوردیەکاندا شیعری بلاو کردۆتەوە . لە هەموو کۆنگرەو میهرەجان‌و دیدارو کۆڕێکی ئەدەبیدا حەسیب گوڵی دەرکەوتووی باخچەیە ، خۆ کۆڕی شەوانیشی ئەوە هەر باسی ناکرێ ، هەرچی خەمی ناو فەرهەنگەکەیەتی لە ئاست هاوڕێ‌و دۆستە ئازیزەکانیا فەرامۆشی ئەکا . وا لێرەدا گفتوگۆیەکی سەرپێی لە گەڵا ئەکەین .

■ **لە کاتێکدا زۆر لەناکاو لە بە ری رابوردودا توشی نەخۆشیەکی کوتو پڕ بوویت‌و ماوەیە زۆریش لە نەخۆشخانە مایتەوە، شاعیرانە هەست‌و نەستی ئەو ڕۆژانەتمان بۆ دەربڕە.**

ـ بەیانیەك وەك هەموو بەیانیەکانی تر خۆم کۆکردەوە بەرەو کار بڕۆم ، بەڵام ئەوەندە هەبوو ئ بەیانییە بیرم لەگەڵی شت کردبووەوە ، بیرم لە خەونەکانی ٣٠ ـ ساڵ لەمەوبەر دەکردەوە ، بیرم لە ئاوات‌و هیواو ئەندێشە ، ژیانم دەکردەوە، سەرم پڕ لە خولیابوو ، لەپڕ گرێك بەربووە کاسەی سەرم ، برووسکەیەك بوو کاسەی سەرمی بڕی‌و لە ناو مێشکما ئاگری نایەوە . هەر ئەوەبوو ئیتر بۆ ماوەی (٤٥) رۆژ لە نەخۆشخانەدا مامەوە ، هەتا ئێستاش شوێن دەستی ئەو بەڵایەم پێوە دیارە ، لەو ماوەیەدا دوای ئەوەی لە مەرگی کوتوپڕ ڕزگارم بوو لەسەر چرپایەی ئازارو ئەندێشە خەونم دەدی ، بیرم لە هاوڕێیەتی‌و ئەمەك‌و برایەتی دەکردەوە،بیرم لە دەیان یادو یادگار دەکردەوە، بیرم لە خۆشی‌و ناخۆشی عومری رابوردووم دەکردەوە ، تاقە شتێك کە رووناکی دەبەخشی بەدیدەم‌و هەناسێ دەدا بە هەناوم‌و گوڕیکی بەدلم دەدا ئەو برادەرو ئەدیب‌و دۆست‌و کەس‌و کارانە بوون کە یەکجار بەتەنگ دڵمەوە بوون‌و پێی دیدەنی‌و سەرائیدانیان لێ نەدەبڕیم‌و دڵخۆشییان دەدامەوە ، هەندێکیان کە لە دەرەوەی سلێمانی بوون برووسکەیان بۆ دەناردم، هەرگیز لاکردنەوەی رۆژنامەی ( هاوکاری )م لەبیر ناچێ کە هەواڵی نەخۆشیەکەم‌و هیوای چاکبوونەوەمی لەگەڵ وێنەیەکما بڵاو کردبووەوە . یەکێتی نووسەرانی کوردو کاك عەلی بۆسکانی ئەدەب دۆست هەردوولایان یارمەتی ماددییان دامو گەلێ دۆست‌و برادەرانی تریش ئامادەبوون بۆ هەموو یارمەتیەکم .

■ **کاتێ ویستم لەبیری کەم**
**بەبیرما هات بیرکەمەوە**
**وەکوو بەهار گوڵێ بگرم بەدەمەوە ، وەکو وەلی بەعەشقی شەمەوە**

■■ **بچمەوە لای . . . ببم بە پەنای**
**رۆژێ ویستم لەبیری کەم**
**نیهادیکم پێ نەمێنێ**
**کە بۆن نەما ، با ، رەشەبا**
**پەڕەی گوڵان هەڵوەرێنێ .**

**کاك حەسیب : لەم رۆژانەدا لە دانیشتنێکی خۆمانەدا گوێم لەم چەند دێرە شیعرانەت بوو سەرەتا مەوام زانی ویستوتە خۆشەویستێك لەبیر خۆت ببەیتەوە بەڵام نەتتوانیوە، جا ئێستا داوای ئەوەت لێ ناکەم شیعرەکەم بۆ یەکالا بکەیتەوە**

**تەنیا ئەمەویّ بزانم کەیو لە کویّو چۆن ئەم شیعرەت وتوە ؟**

ـ ئەو شیعرانەی وا بۆم دەخوێنیتەوە دوای دەرچوونم لە نەخۆشخانە ئەمەکی من بوو بۆ ئەو هاوڕێو دۆستانەی سەریان لیّ دەدام بە تایبەتی ئەو گو ڵ بەدەستانەی دڵمیان وەکوو چەپکە گو ڵەکانیان دەکردەوەو وزەی ژیانیان پیّ دەبەخشیم و دەیان خستەوە یادم کە من ڕۆژیّ لە ڕۆژان شاعیری گو ڵو جوانیو جوانان بووم .

**■ چ ڕیّنماییەکت بۆ شاعیرە لاوەکان هەیە !**

ـ ڕێنماییم بۆ شاعیرانی لاو ئەوەیە سەد جار بخوێننەوەو جاریّ شیعر بڵێن ، بە هەموو ئەدەبو شیعری نەتەوەیماندا چەند جاریّ بچنەوەو لیّی ووردبنەوەو چێژی لیّ وەربگرنو بیکەن بە توێشە بەرەی کاروانیان .

**■ گۆڤاری ( کاروان ) دەیەویّ لە کاروانی ڕۆژنامە نووسی کوردیدا جێگایەکی دیاری هەبیّ ، ئەم ژمارانەی دیوتن بەلاتەوە چۆن بوون ؟ چ پێشنیازێکت هەیە بۆ ئەوەی زیاتر تینی بەرێتە بەر .**

ـ ئەوەی دڵخۆش دەکاتو تین دەدا بە هیوای باشترین ئاواتیشان بۆ « کاروان » ئەوەیە ئەو مامۆستاو برایانەی کە جڵەوی کاروانیان گرتۆتە دەست هەموویان دنیا دیدەی ئەدەبو ڕۆژنامە نووسینو لەم بوارەدا پسپۆڕو لیّهاتوون ، خۆیان چاك شارەزان لە ڕێگەی سەرکەوتنو دواکەوتن ، دەزانن کامە ڕیّی ڕاستەو ڕەوانە بۆ ـ کاروانـو کامەیش ڕێگەی چەوتەو هەڵەتە ، لەبەر ئەمانە بۆ من نەهاتوە ئامۆژگاری ئەوان بکەم ، ژمارەیەكو دووی ئەم کاروانە ڕوو لە سەرکەوتنو هەڵکەوتنە ، گرنگ ئەوەیە باشتر بڕواتو هیچ هەڵەتیّ نەیەتە ڕێگەی .

**■ ڕات بەرامبەر بە شیعری کوردی لەم قۆناغەیدا چییە ؟**

ـ بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە پێویست بەوە ئەکات ، مرۆڤ بگەڕێتەوە بۆ سەر کۆمەڵێك سەرچاوەو بەراوردکردنی کۆمەڵێك شیعری کوردی لەتەك شیعری گەلانی دەرو دراوسیّو خەڵکانی دوور وڵاتیشدا ، ئەم جا ئەتوانرێت پایەی شیعری کوردی ئێستەمان دەست نیشان بکرێت بەڵام ئێستەو بۆ بەرەیەك لە ( کاروان ) یا چەند لاپەڕەیەك ئەمە مەیسەر نابێت . نکوولی لەوەدا نییە دوای حەزرەتی نالیو هاوڕێکانی بۆ ماوەیەکی درێژ شیعری کوردی بەجێما لە کاروانی ڕێگرتوو ئەویش بە هۆی ئەو دەرفەتە ناهەموارانەوە بوو کە گەلی کوردی پێدا ڕۆیشت ، بەڵام دوای دەرکەوتنی شێخ نوری شێخ صالحو هەڵکەوتنی گۆرانی نەمر، شیعری کوردی ڕێگەی نویّی گرتە بەرو لەم بوارەشدا گەلیّ شاعیری تر بەشداری پێشخستنی کاروانی شیعری کوردییان کردووە ئەگەر چی هیچ هەنگاوێكو قۆناخێکی ئەم کاروانە بیّ کەندو کۆسپ نەبووە ، کاروان هات .. هات هەتا لەپشتە سالانی شەست بەدواوە ، بیّ گومان گۆڕانێك بەسەر شیعرماندا هات گەلیّ بەرگی کرا بەبەردا کە زۆریان کالا بەپیّی بالا نەبوو ، ئەم گۆڕانەیش ئەنجامی کۆمەلیّ دیاردەی ڕۆشنبیریو ئەدەبیو گۆڕانی دۆخی کۆمەلایەتیو سیاسیو ئابووری بوو لەتەك سەر هەلدانی شیعری نویّی عەرەبیدا کە کلاو ڕۆژنەی ڕۆشنبیریی زۆربەی خوێندەواری کوردە بۆ شیعری جیهانیو ئەو ژانە بەسوێیانەی کە دەروونی شاعیرانیان ئەهێنایە کوڵ . شتەکە وەك تەقینەوەیەك وابوو لای ئێمە ، لەبەر ئەوە گەلێك هەڵەوسەرە ڕۆیی لەم گۆڕانەدا ڕوویدا ، خەریك بوو کار بکاتە ئەوەی شیعری کوردی ببێزریّو لەبەر چاو بکەوێت هەتا وردەوردە ئەو کەفو کوڵە نیشتەوەو لە سالانی حەفتا بە دواوە شیعرمان ڕۆژ بە ڕۆژ سەقام گیرتر دەبیّ لەسەر ڕێبازی نویّو پێشکەوتندا لە لای شاعیرەکان، هەر چەند بە ناشکوری نالێم زۆر کەمن ، بەداخەوە لە لای نیمچە شاعیرەکان ( کە باویان هێشتا ماوە ) ئێستەش مەسەلەکە هەر ڕستە ڕیز کردنە بە ئیقاعێکی بابلێین عەرووزی بەرەلای بیّ سەرو بەرو پێچراوەو پڕ لە ئیستیعاراتی نەگونجاوو دوور لە هەستو چێژی کورد ، ئەوەی دڵ خۆش ئەکات ئەوەیە خەڵکێکی فرە هاتوونەتە گۆڕیّ کە پاكو چاکیو ڕەسەنایەتی شیعریان مەبەستەو چاویان لە هەڵسو کەوتی کاروانەکەیەتی ، ئەو شیعرەیش ئەمێنێتەوە کە هەست بزوێنیّ نەك سەرنج ڕاکێش ، خورپە بخاتە دڵ ، نەك ختووکەی سۆز بدا ، سەرگەرم بکات نەك ئەندێشە بشلەژێنی ، زمانێکی ڕەوانە ، کوردییەکی پوخت خواستنێکی (ئیستیعارە ) ناسراو ئاشنا بە دڵو دەروونو خەیاڵ، وێنەیەك ، تابلۆیەك کە نامۆ نەبیّ بە بیرو چێژو ڕەوشتو ئەندێشەمانو دا نەبڕابیّ لە کەلەپووری ئەدەبیو مێژوییو فۆلکولۆرمان. بە کورتی ئاشنابیّ بە کورد ، پردی نێوان بیّ لە میانی خودو دەروونی شاعیرداو خەڵكو دەورو بەر، بابەتیو خەست بیّ خۆ لە قەرەی گەڕانەوەو ( تداعی ) دراما بدات بە باڵی خەیاڵ ، خەیاڵێك ئاواتو ئازار دایكو بابی بێتو شیعر ببیّ بە لانکەو هێلانەی ، ئاواتو ئازارێکی ئاشنا بە خەڵك لە ژیان هەڵقوڵاو ، ڕەواو ، ڕاست، هاوشانی بیری ڕووناكو هۆشی مرۆڤایەتیو نەتەوە بیّ زەنگی زوڵالی کاروانی ڕیّگرتوویی ، خۆش بیّ لەسەر زمانو لە ناخی دەروونداـئۆقرە بگریّو جێگەی خۆی بکاتەوە دوور لە سەفسەتەو فیشاڵو لەخۆ بایی بوونو گۆشە گیری . ئەمە دیاردەو ڕوانگە نویّ کانی شیعری نوێیەو ئەگەر بەراوردی گەلی کورد لەگەڵ گەلانی هاو چەشنی خویدا بکریّ شیعری ئەمیش لە دواوە نییەو دۆش دا نەماوە .

# گەشتێك بەنێو پۆستەی «كاروان» دا

● ئامادە كردنی ●
سۆران

خوشكو برایانی ئازیز؛ وا لە ژمارە یەكی تری گۆڤارەكەماندا بەیەك دەگەینەوە و بۆ جارێكی تر لەگەڵ بابەت و نووسینەكانی ئێوەی ئازیزدا دەگەڕێینەوە جیهانی نرخاندن و هەڵسەنگاندنی كورپەلە شیرینەكانی مێشك و دڵ و دەروونی ئێوەی خۆشەویست؛ ئەو بەرهەمە ئازیزانەتان بە كاڵا دەكەینەوە كە لەلاتان زۆر خۆشەویست و پیرۆزن و زۆری پێوە هیلاك بووین و مێشك و بیری خۆتان پێوەی خەریك كردووەو بەكو زۆربەشتان شەونخونیتان بۆی گرتووە و بە دیار چرای كزو تیشكی كارەباوە تا كاتێكی درەنگی شەو ماونەتەوە، هەر بۆ ئەوەی لە كونجێكەوە دیاری یەكی خنجیلانە پێشكەش بە «كاروان» بكەن و خزمەتێكی ئەدەب و رۆشنبیری كوردی پێ بكەن..

بێگومان حەزمان دەكرد ئەو بەرهەمە ئازیزانەی ئێوە دەست بە رووپانەوە نەنرێ و نەكەونە نێو پۆستەی كاروانەوە و وا نەدرێنە قەڵەم كە شیاوی بڵاوكردنەوە نین، بەلام كورد واتەنی «لە پڕێ نابی بە كوڕێ» یا «سوار تا نەگلێ نابێ بە سوار»، بۆیە ناچار بووین كە هەر لەم گۆشەیەدا، گۆشەی پۆستەی كاروان بابەتەكانی ئێوە هەڵسەنگێنین و بە چەند قسەیەكی شیرین و ناسك وەلامی ئێوەی خۆشەویست بدەینەوە و هیوادارین بە دڵێكی فراوانەوە لێمانی وەربگرن و دڵتان نەرەنجێ..

جا وەكو لە ژمارەیەكی كاروان دا بە لێنمان پێ داوون كە «كاروان بكەینە مەنبەرێكی سەربەست بۆ هەموو قەڵەمێكی خێر خوا» هەر لەبەر رۆشنایی ئەم بەلێنەیش دووبارە رووتان تێ دەكەینەوەو بەو هیوایەی كە لە بەرهەمی بەتام و بۆو دەوڵەمەندی ئێوەی دڵسۆزو خۆشەویست دانەبڕین و بەردەوام هاوكاریمان لەگەڵدا بكەن.. ئێستایش لەگەڵ وەلامدانەوەی نامە شیرنیەكانی ئێوەی ئازیزو بەرێز ئیتر هەڵبژێن..

● بۆ ئەو برا ئازیزانەمان كە ئەم بەرهەمانەیان بۆ ناردووین:

«كوردوستانی ئێران، گوندەكەم، میدیا،

